بەم شێوەیە لەو شێواندنەی بەرگێکی شەرعی دەبەر .کرا بە کاریگەری راگەیاندن و .بوو بەکارتێك و بەرز دەکرێتەوە لە شێوەی فیلم، چەوساندنەوەی جوولەکەی پێ دێنێتەوە یاد لەسەر دەستی نازیەکان لەو کاتانەی، دەنگ بەرز دەبێتەوە بە ئازاد کردنی خاکی ئیسلامی داگیر کراو بە قودسی پیرۆزەی‌شەوە لە دەست داگیر کردنی جوولەکە.

## پلانی تری راگەیاندنی جوولەکە

هەرتزل لە یاداشتنامەکەیدا دەڵێت: "دەنگە دەنگ هەموو شتێکە، بەراستی دەنگە دەنگ (الضجیج) دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کاری گەورە)[٣٠]. چونکە ئەو دەنگە دەنگە سەرنجی خەڵك رادەکێشی، و سەرکەوتن ئامادە دەکات، دوژمن لاواز دەکات، و جەنگ دەگوازێتەوە بۆ بارو دۆخێکی جیهانی و گرەوەکانی یەك لاکردنەوەی بۆ دەرەخسێنێ .

جولەکە هەڵدەسێ بە بلاوکردنەوەی پرۆپاگندەیەکی فراوانی دارێژراوی رێك و پێك لە رێگای دەزگاکانی راگەیاندن و بیرو هۆشەکان ئامادە دەکات بۆ وەرگرتنی وقەبوڵ کردنی حەقیەتی زاڵ بوونی جوولەکە بەسەر جیهانداو حوکمڕانی کردنیان لە سەرتاپای جیهاندا، ئەمەش بە گوێرەی ئەوەی کە لە پرۆتۆکۆلی حەوتەمدا هاتووەو دەڵێ: (پێویستە کار بکەینە سەر ئەو دەوڵەتانەی کە جوولەکە نین لە رێگای. ئەوەی کە ناوی دەبەن، بەرای گشتی، کە ئامادەمان کردووە لە رێگای بەهێزترین هێز ئەویش کە رۆژنامەوانیە، چەند حاڵەتێکی لاوەکی نەبێت کە زۆر کاریگەر نیە، دەنا ئەوەیتر هەر هەمووی بە دەست خۆمانە، ئیتر گشت هۆکارەکانی راگەیاندن بگرە هەر لە رۆژنامەوانی و پرۆپاگندە وەك ئیستگە و تەلەفزیۆن و سینەما و گۆڤار و

ئاژانسەکانی دەنگ و باس کە گرتویانەتە دەست بە هێزی سامان، لەو ڕێگایەنەوە جەنگێکی دەروونی بەرپا دەکەن دژی دوژمنەکانیان[٣١]
وە لەو نەخشە پرۆپاگندانەدا (پێداگرتن لەسەر ئینکار کردنی نەبوونی خەڵکی فەلەستینی هەروەك غولدا مائیر رای گەیاند، ڕۆشنایی خستە سەرنەوەی جوولەکەو ئیجبار کردنی خەڵکانی تر بە دانان بە بوون و هەبوونیان، و شێواندن و لێ کەم کردنەوەی پایەو ناوبانگی موسڵمانان، وێرای کەم کردنەوەی لاپەرەکانی فەرهەنگی خوێندنی قوتابخانەکان کە دەربارەیان (موسڵمانان) دەدوێ، بە جۆرێك کە تەنها لە ماددەی سیستەمی کۆمەڵایەتی خوێندنی قوتابخانەکانی ئیسرائیلی و بە تایبەتی لە کتێبی جوگرافیادا لە پۆلی چوارەمەوە تا هەشتەم ولاّتانی ئیسلامی (ناوچەی عەرەبی) لە کۆی ١٦٠٠ لاپەرە تەنها ١٣٤ لاپەرەی بەرکەوتووە! لەکاتێکدا کە گەلانی ئەورروپای ڕۆژئاوا ٢٢٠ لاپەرەی بۆتەرخان کراوە، بە هیچ شێوەیەك ناوی لیبیا و سودان و ئەریتیریا و ولاّتانی کەنداو ناهێنێت ...
وە لە فروفێڵەکانی تری جوولەکە کە لە ڕاگەیاندنەکانیدا کە گرنگی پێ دەدات، ئەوەیە کە موسڵمانەکان دواکەوتوون، جا چ لە بواری جەنگا بێت، یان لە بواری زانستی، یان شارستانی بێت، ...ئەوەش بە دیارخستن و پیشاندانی چەند لایەنێك لە جەنگی حوزەیرانی ١٩٥٦ و پیشاندانی مرۆیەتی سەربازی بوو کەلە بەرامبەر لاوازی موسڵمانان و پاشەکشێیان، کەچی لەبواری زانستیشەوە بەراورد لە نێوان دواکەوتنی موسڵمانان دەکات لەگەڵ پێش کەوتنی ڕۆژئاوا و سەرکەوتوویی زانستی جوولەکە، و جەخت کردن لەسەر پێشکەوتوویی ئیسرائیل و هەژاری موسڵمانان و جۆری ژیان و بیناسازیان بەو سادەیی و سەرەتاییەی کە هەیانە.
هەروەها لایەنێکیتر لە تەڵەکەبازی پلانە بۆگەنەکانیان، ڕووناکی خستنە سەر لایەنی دووبەرەکی تایەفی و ڕەگەزی نێوان موسڵمانان و هاندانی کەمایەتیەکان و دابەش کردنی دانیشتوان بۆ چەند یەکەیەك، موسڵمانان، دیان ، قبتی ، سوننە، شیعە ،

عەرەب ، درۆز، بەربەری بەگژیەکدا چوو و دابەش بوونی، بەڵام ئیسرائیل نەوەیەکی خاوەن هێزەو سوپاکەی نەبەزو نەوەیەکی شارستان ویست، و پێشانداني ئیسرائیل بە دەوڵەتی دیموکراسیو موسڵمانان بەژێردەستەییو دواکەوتوویی لەقەڵەم دەدەن.

**لە فێڵەکانی راگەیاندن:**

**شێواندن (تشويه)**: شێواندن و سەراوگێر کردنی لێدوان و، وتەو راگەیاندنەکان و لێدوانی کەسایەتیە ناسراوەکان.

**هەڵبەستن (الاختلاق)**: هەڵبەستن و دروست کردنی لێدان و دانە پاڵ سەرچاوەیەکی دیاری کراو بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان وڵاتە ئیسلامیەکان و موسڵمانان بەشێوەیەکی گشتی.

**قەڵپ کردنی وێنەکان (تزوير الصور)**: وەك سڕینەوەی وێنەی کەسێك لە وێنەیەکدا و دانانی وێنەی کەسێکیتر لە شوێنی ئەو هەروەکو دانانی وێنەی هرتزل لەگەڵ قەیسەری ئەڵمانیا لە شوێن یەکێ لە سەرکردەکان.

**چەوسانەوەی نووسەران** (اضطهاد الكتاب): ئەویش بە تیرۆر کردنیان، کە زۆربەی نووسەرو شاعیری فەلەستینی، کوژران، بۆ کپ کردنی دەنگەکانیان.

بەربەست دانانیان لەبەر دەم کارامەکان لە بیرکردنەوەو بەرهەم هێنان، بە مل کەچ کردنیان بۆ لێکۆڵینەوە و پرسیار و وەڵامی پیاوانی ئاسایش.

سەپاندنی نیشتەجێی زۆرە ملێ (فرض الاقامة الجبرية) بەسەر "رۆشنبیران" یان گرتنیانو بەند کردن و ئەشکەنجە دانیان بەشێوەیەکی نامرۆڤایەتی و مانەوەیان لەناو بەندیخانەکاندا بەبێ دادگایی کردن ... و دوور کردنەوەی کەسانی هۆشیار بۆ چۆڵ کردنی گۆرەپان و وەدەرنانی گەلی فەلەستینی موسڵمان، بگرە ئەوانەی موسڵمانیش نین، مەیسەر نەکردنی کار بۆ دەرچوان و لە دوایش پەنا بردنیان بۆ دەرەوەی وڵات،

دانان و سەپاندنی سانسۆرێکی توند بەسەر هۆکارەکانی راگەیاندنی فەلەستینی و بەکارهێنانی توندڕەوی لە دژیاندا. هەوڵدان بۆ نەهێشتنی زمانی عەرەبی و جێگیر کردنی زمانی عیبری، ئەمەش وای کرد کە رێژەیەکی زۆری موسڵمانان زمانی عەرەبی نەزانن، بابەتی ئایینش تا ساڵانی ١٩٦٥ لە قوتابخانەکاندا نەدەوترایەوە.

هەوڵدانیان بۆ قەڵاچۆکردنی فەرهەنگی ئیسلامی ئەویش بە لابردنی ئەو ئایەتانەی کە باس لە سیستەمی حوکم دەکات لە ئیسلامدا، یان رێکخستنی کۆمەڵگاو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لە وانەکانی ئاییندا، گرنگی دان بە ووشە گشتیەکان، رەوشت وەك خۆشویستنی مرۆڤایەتی، برایەتی، لێ بووردەیی و ئەو ووشانەی کە لەبەرژەوەندی ئەواندان و نابنە کۆسپ لەبەردەم سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر موسڵماناندا، هەروەها دەست خستنە ناو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و گومان خستنە ناو بانگێشتی ئیسلام و و رواندنی گومان بگرە هەتا لە قورئانی پیرۆزیشدا و شێواندنی رووی جیهادی ئیسلامی هەروەکو لە کتێبی (الیهود والمسیحیه والاسلام)دا هاتووە دەڵێ: (محمد سەرکردایەتی جەنگێکی کرد، کە گشت گەل و هۆزێکی لەناو برد لەوانەی، رازی نەبوون بە رێنومایەکانی)[٣٢]

هەروەها گومان کردن لە کاری گیان بازی و فیداکاری و داماڵینی متمانەی گەڵ بەسەرکردەکانیان و گومان دروست کردنی هەندێکیان بەهەندێکی تریانەوە لەناو خودی خاکی داگیرکراودا.

و هەوڵدانی بێ ووچان بۆ ناشتنی بێ ئومێدی و بێچارەیی لە دڵیاندا وەك لە وتەیەکدا هاتووە دەڵێ: (هەر کەسێ گیرودەی چوونە ناو ریزەکانی بەرگری ببێت، هیچی وەدەست نایەت جگە، لە کاولکاری و لەناوچوون نەبێت، چونکە دەستی سوپای ئیسرائیل درێژە و خاوەن مشتێکی پۆڵایینە و بەزەیی بە کەسدا نایەتەوە!!)[٣٣]

## چۆن خەڵکی لەخشتە دەبەیت لەرێگای راگەیاندنەوە؟

کارامەیی راگەیاندنی جوولەکە لە پەیڕەو کردنی درۆو هەڵبەستندایە، ئەویش بە قەناعەت پێ هێنانی ئەو کەسەی کە بیرۆکەکانی بۆ رەوانە دەکرێ لە رێگای هۆکارەکانی راگەیاندنەوە، هەروەها فریودان و شێواندن، سەراوگێر کردنی و بەکارهێنانی پرۆپاگندەی توندو تیژی و بلاّوکردنەوەی ترس ... و دروست کردنی رووداو بۆ پاکانە کردنی پێشەکی. بۆ ئەو کارانەی کە وەزارەتی بەرگری ئیسرائیلی پێی هەڵدەستێت وەك خستنە خوارەوەی فرۆکەیەکی لیبی، کە رێگای وون کردبوو، و نزیکەی (١٠٠) کەسی تیا کوژران لە خەڵکی مەدەنیی بێ تاوان و لەوەیان دایە پاڵ ئەو رووداوە دەستکردە کە بە بوونی گومان و پرۆپاگندە بۆ خۆکردن، لەوەی کە ئیسرائیل ترسی هەیە لەوەی کە کەوتنە خوارەوەی ئەو فرۆکەیە لە سەر دەستی فیدالیەکانەوە بێت، لە سەر خاکی ئیسرائیلی بۆ ئازاردانی خەڵك بەو (TNT)ی کە هەڵی گرتبوو ...

وە لە شێوەکانی تری چەواشە کردن لە رێگای راگەیاندنەوە، هەڵبەستن و دروست کردنی لێدوان و وتە و دانە پاڵیان بۆ چەند کەسایەتیەك و بڕینی چەند بەشێك لێیەوە و شێواندنی ناوەرۆکەکەی، وەك جەخت کردنی لە جەنگی ١٩٦٧ لە هەڕەشە کردنێکی وەهمی بە فڕێدانی جوولەکە بۆ ناو دەریا، دواتریش بۆ لێکۆڵینەوەران و خاوەنە پەیوەندیەکان، لە ناوچەکەدا دەرکەوت کە ئەو شتە هیچ راستیەکی نیە و تەنها هات و هاوارێکی جوولەکە بووە.

وە راگەیاندنی جوولەکە هەمیشە هەوڵ دەدات کە دروست بوونی رووداوەکان هەڵ گەرێنێتەوە، لەوەی سوپای میسری دەست پێشخەر بووە لە هەڵگیرساندنی جەنگەکەی ساڵی ١٩٦٧ و یان، خەڵکی دیر یاسین، شەڕیان بە جوولەکە فرۆشتوە نەك جوولەکە ...!.

وەهەروەها لە جۆرەکانی لۆژیکی نالەبار راگەیاندنی جوولەکەدا شێوازی تێکەڵکردنی مەسەلەکەو مرۆڤە، وەك هەڵقوستنەوەی زانایەك یان نووسەرێك بۆ بەهەرمێن کردنی ئەو شتەی کە دەیەوێت، ئەویش بە دیار خستنی ئەوەی کە دەیەوێت بی‌لێت لەسەر زمانی ئەو زانایە یان ئەو نووسەرە، هەروەکو لەگەڵ زانای کیمیاوی جولەکە (حایيم وایزمان)ی توندڕەوکردیان بە گرنگی دان بە پەخش و بلاوکردنەوەی کارەکانی لە بواری کیمیا و وتارەکانی‌دا، کە لە بەدرزەوەندی جوولەکە دان و سەرنج راکێشانی خەڵك کە نابێ و ناکرێ زانایەکی وەك ئەم کەسایەتیە شتی نەگونجاو بلێت و باس لە شتێك بکات ئەگەر رەوا نەبێت. هەروەها لەو شێوازانەی کە هەمیشە بەکاری دێنن، خۆ بەزل و بەهێز زانینە و، بەکارهێنانی هونەری چوونە ناو پەروازە پێچەوانە کراو و درۆ گەورەکان، و بەیان کردنی بریاری کۆتایی یەك لاکەرەوە، کەوا لە گوێگر بکات کە بەوپەڕی متمانە و راستگۆیی وەریگرێت و گومان بە یەکجاری بسڕێتەوەو، بە درۆخستنەوەی ئەو کەسەی کە گومان لە هەواڵەکەیان بکات.

لەوانەش راگەیاندنی دەرەنجامی ئیستفتاء درۆ دروستکراوەکان و وا دەرخستنیان کە زۆرینەی خەڵك لەگەڵ ئەم بیرۆکەیەدان یان لەگەڵ ئەویان و هەروەها دووبارە کردنەوەی لە نێوان پرۆپاگندەکاری جوولەکە و جەخت کردنە سەر ئەوەی کە مەبەستە، لە چەندها کەناڵ و شوێن و کاتی جیاجیادا تاوای لێ دێت کە گوێگر باوەڕی پێ بکات پاش ئەوەی کە لە گشت لایەکەوە گەمارۆ دەدرێت و پەلاماری دەدرێت.

## رادیۆ و تەلەفزیۆنی جوولەکە، چی پەخش دەکەن؟

لە هۆکارەکانی راگەیاندنی جوولەکە کە هەڵدەسیٚ بە ئەرکی گومڕا کردن و لە خشتە بردن و گەندەڵی بڵاوکردنەوە:

رادیۆی ئیسرائیلی کە بەرنامەکانی بە زمانی عەرەبی پەخش دەکات بۆ ماوەی (١٨) کاتژمێر لە رۆژێکدا و (١٤٠) فەرمانبەر کاری تێدا دەکەن، ئەمە وێرای سوپایەکی تایبەت مەندانی بواری راگەیاندن و دەروونناسی و کۆمەڵناسی، بۆ مسۆگەر کردنی کاریگەریەکەی بەسەر خەڵکیدا.

وە زۆربەی پەخشەکانیش بریتین لە گۆرانی و بەرنامەی ئاراستە کراو وەك، بەرنامەی ستۆدیۆ ژمارە یەك کە رۆڵی بەرچاو کردنی دیموکراسیەت بەرپابوونی لە ئیسرائیلیدا گرتۆتە ئەستۆ، بە تیشك خستنە سەر سکاڵای هاوولاتیان و گرنگی پیٚ دانیان لەگەڵ (١٢) درێژەی دەنگ و باس و (١٤) کورتەی گرنگترین هەواڵەکان کە هەر خریشیان بە چڕی لەسەر باری ستەملێکراوی جوولەکە دەدوێن و بەرگری کردن لە خۆیان.

وە ناو زەد کردنی موسڵمانان بە تیرۆریست و هاندانی گەلان دژی فەرمانڕەواکانیان و دەست خەڵەتدانی فەرمانڕەواکان بەرامبەر بە گەلەکانیان و بەتایبەتیش بانگخوازانی ئیسلام، وەك ئەو بەرنامەیەی کە پەخش دەکرێت بۆ گەلانی عێراق، بەزاراوەی میللی بۆ زیاتر کارتێکدانیان ... کەچی گۆرانیەکانن، زیاتر لایەنی سۆزو دڵداری بەخۆوە دەگرن و دور لە بنەماکانی رەوشت و مانا کۆمەلأیەتیەکان، کە بەشێوەیەك گوێگر دەباتە دونیای پڕلە حەز و ئارەزوو و ئامادە کردنی بۆ بەردەوام بوونی لە بیستنی بەرنامەکانی تری داهاتووی کە بریتین لە، جەنگێکی دەروونی و ترساندنی لە ئاکامەکانی جەنگ ولاوازکردنی ورەو متمانەی گوێگری موسڵمان بە خۆیەوە لە کاتی ئاشتیدا.

لەوانەیە رادیۆی ئیسرائیل هـەوڵی لـە دەسـت چوونـی چـەند شـارێك بـڵاو بکاتەوە لەکاتی شەردا هەر بـە درۆو دوور لـە راستی، تەلەفزیۆنەکەشیان، رۆژانـی هەینی فلیمێکی بێ ئابرۆیی رووت (خلاعی) پەخش دەکات، ئەمـە جگـە لـەو فلیمـە رووتە جێگیرانەی کە لە زۆربەی رۆژەکـان پـەخش دەکرێـن لەگـەڵ پـەخش کردنـی هەندێ لە بەرنامەی گۆرەپانی بۆنەو مناسبە تایبەتیەکانی ئیسـرائیل و ئـەو رووداوانـەی کە روو دەدەن بە مەرجێك گونجاو بێت لەگەڵ بیرو بۆ چوونی سەدا سەدی جوولەکە. هەمان شتیش لە سینەماکان پیشان دەدرێت، کە ئەو بەرهەماندی بۆ ئەو شوێنانە ئامـادە دەکرێن دەبێت لە خزمەتی ئامانجە رامیاری و راگەیاندنەکانیاندا بێت.

لە رۆژنامەوانیشدا ...

لە گرنگترین هەڵمەتەکانی لە خشتەبردنی راگەیاندنی جوولەکە: بەکارهێنانی نەخشەی پڕ کردنی راگـەیاندن بـە چـڕی ماددەکـان بـۆ سـەپاندنی بـیرو بـۆ چوونـی جوولەکە لە رێگای چەند روانگەیەکی راگەیاندن، بەکارهێنانی ئـەو پروپـاگندەی کـە بەشێکی راست بەخۆیەوە دەگرێت بە روونکردنەوەیەکی تـەواو و وورد، و دەوردانـی ئەو پرۆپاگندەیە بە چەند شتێکی وون! ئاوای لێ دەکات کە کاریگەر بێت لەسەر ئـەو کەسەی کە بەرچاوی دەکەوێت وەك ، بڵاوکردنەوەی، کوشتنی گەنجانی موسـڵمان و پەلاماردانی ئافرەتی موسڵمان لە لایەن سـوپای ئیسـرائیلیەوە، بـووە مایـەی راکردنـی ٢٠٠٠٠٠ دوو سـەد هـەزار هـاووڵاتی فەلەسـتینی لەترسـی کـارە تیرۆریەکـەی ئیسرائیلی، ئەوەش هەر تەنها بۆ تۆقاندنی خەڵك بووە، ئەگینا هیـچ راسـتیەکی نـەبوو لەسەر ئەرزی واقیع دا!؟

# جوولەکە و بازرگانی کردن بە جنس

لەم بوارەدا "محمـد قطـب"، نموونـەی زۆری هێناوەتـەوە لەسـەر هەوڵـەکانی جوولـەکە بۆ تێکدانی شێوازی پیاو و ئافرەت و خەریك کردنیان بـە (جنـس)ی نـاڕەوا (محرم) و دوور کردنەوەیان لـە ڕۆڵی گرنگی پێسپێردراویان لـە پێگەیاندن و پـەروەردە کردنی منالەکانیان کە لـە دوا ڕۆژدا (منالێکی چـاك - صـالح)ی لێ وەپـاش کـەوێت، وچۆن هەوڵ دەدەن لـە هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندیەکانی خێزان و کۆمەڵگاو وێل کردنی مرۆڤایەتی بە شێتایەتی جنـس، سـینەما، تەلـەفزیۆن، تـۆپ تۆپێـن و شـێتایەتی مـۆدە و لاسایی کردنەوە.[٣٤]

بەڵام ئەو کەسەی پەیوەست دەبێت بە ئایینەکەی و، یـان بیـەوێت زانسـتیانە تایبەتمەندی تیا وەرگرێت، ئەوا لـەلایەن ئەوانەی کە لـە بـواری ئێسـتگە، تەلـەفزیۆن و وێنەکێشـان کـار دەکـەن هـەروەها نووسـەرو ڕۆشـنبیران و هونـەروانان چـیرۆك نووسەکانیشەوە، شتی سەیریان دەدرێتە پاڵ وەك: دواکەوتوو، دوورەپـەرێز، سـاویلکە بەڵام کەسێکی (ملحد) هەر کەس باسی ناکـات، ئەگـەر بـە مرۆڤێکـی ئـازاد فیکـرو خاوەن ئاسۆیەکی گەش لـە قەڵەمی نەدەن!.

هەروەها ئەوەش باس دەکات لـــە وونکردنـی کـاری (جنسـی) گشـت بـیرو بۆچوونەکانی شەرعی، لـە هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا، ئەوەی شانۆی ئەمریکی لە ڕێگای تەلەفزیۆنەوە پەخشی کرد شانۆگەریەك بوو کـــە پێـك هـاتبوو لـە کردارێکـی بەیـەك گەیشتنی ئـافرەتێك و پیـاوێك (جنسـیاً) کـە تـەواوی هـەناگاوەکانی پـەخش کـرد و خەڵکیش سەیری وێنە گواستراوەکانیان دەکرد، ڕاستەوخۆ!

هەروەها تەلـەفزیۆنی بەریتانی، مێزگەردێکی (جنـس)ی سـاز کـرد بـۆ دەیـان کچی تازە پێگەیشتوو دەربارەی ئەوەی ئایا کام شێوە لـە شـێوەکانی بەیـەك گەیشـتنی

سێکسیان (پێ خۆشه)! بەڕێوەبەری مێزگردەکە کە ئافرەتێك بوو بەبێ پەردەو بێ شەرمانە پرسیاری دەکردو کچەکانیش وەڵامیان دەدایەوە، و زۆر بە ئاسایی.

بینەرانی تەلەفزیۆنی ئەمریکی گێڕایانەوە کە بەرنامەیەکی تایبەتی سازدا لەگەڵ ئەو کەسانەی کە داوێن پیسی لەگەڵ نەشیاوانیان (الزنـا بالمحرمـات) یان ئەنجام داوە، وەك نعوذ بالله، (باوك لەگەل کچی خۆی و کوڕ لەگەڵ دایکی)دا، بەڕێوە چوونی چۆنیەتی پرسیارو وەڵامەکانیش زۆر ئاسایی بووە لە هەواو کەشێکی ئاسایی‌دا کە پڕبوو لە بابەتی چێژ وەرگرتن لەلایەن ئەوانەوە!.

کەچی سینەماو هۆڵەکانی نمایش کردنی جل و بەرگ و جوانکارییەکان، ئەمەشیان پەتێکی جوولەکەیە و سەرمایەدارەکانیان بە پارە پشتیوانیان لێ دەکەن و ئەوانیش لە بەرامبەردا بە لەشکر قوربانیەکانی فێربوونی خواردنەوەی مەیی و ماددە سەرِ کەرەکانیان پێش کەش دەکەن، بۆ ئەنجامدانی کاری داوێن پیسی لە گەڵیانا بەناوی دیموکراسی.

تۆبی پێش، ئەو یاریەیە کە، نکسۆن دەربارەی دەڵێ: ئەمە دروشمی شارستانیەتی ئەمەریکایە، ئەمەریکا توانی دەسەڵاتی خۆی بسەپێنی بەسەر میللەتانی تردا لەوانەش ژاپۆن. بە خەریك کردنی گەنجان و دوور خستنەوەیان لە واقیعی ژیان و گیروگرفتەکانیان و مافە رەواکانی گەلەکەیان، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەم پاڵەوانە، یان ئەویان بووە ستێ یان ئەم تیپە و ئەو یانەیە وەك هاندەر، جوولەکەش لە پشت پەردەی شانۆوە لەوپەڕی بەختیاریدان.

ڕۆژ بەدوای ڕۆژیش گرنگی پێدانی ڕاگەیاندن بە ئافرەت پتر و پتر دەبێت، چونکە هەڵبەتە دەرهێنانی ئافرەت لەبارەگا ڕەسەنەکەی کە ماڵە، دەبێتە مایەی ئاسان کردنی ڕاوکردنی و کارتێکردنی بەشێوەیەکی فراوانتر و داشۆرینی لەوبڕە شەرم و پارێزگاریەی کە ماویەتی (گۆڤارەکان وێنە بڵاو دەکەنەوەو دەست خۆشی لە سەربەستی دەکات ووتەو بابەتی وای لەسەر دەنووسن بە جۆرێك وا لە کچ دەکات

که هیوا بخوازێت هەر لەم دەمەوە خـۆی دامـاڵێنی لــە شـەرم، بـەڵکو ببێتـە یـەکێك لەوانەی ناوبانگ و شوهرەت پەیدا دەکەن و خەڵك باسان لێوە بکات)[٣٥] بەتایبەتیش ئارەزووی ئافرەت لەوەدایە کە وێنەو نامەکانی بلاوبکرێنەوە لــە ڕێگـای هۆکارەکـانی ڕاگەیاندنەوە، نەخوازەلا ئەگەر (ئافرەتەکـە جـوان بێـت) ئـەوا زوو نێچـیر دەکرێـت، ووردە ووردە بەرەو جیهانی نێریەنەکان موگناتیس کێش دەکرێت بۆ مەبەستی ڕابواردن و سوود لێ وەرگرتن ...

(سارتەر)ی لە دایەك جوولەکە، دەستوری جوولەکەش وایە هەر کەسێك کە دایکی جوولەکە بێت ئەوا بە جوولەکە دادەنرێت، لە کتێبێکــدا بـەناوی (تـأملات في المشكلة اليهودية) Reflections Sur laquestion Juire دانی بەوە ناوە کە ڕاستە جوولەکە گرنگی بەسـێ شـت دەدەن: پەرسـتنی زێـر ، ڕووت و لۆخـت کردنـەوەی لەشی مرۆڤ و بلاوکردنەوەی عەقلانیەت دژ بە پـەیامی ئـایینی)[٣٦] ... پـەیرەوکردنی جوولەکەش لە بەکارهێنانی جنس هەر لە کۆنەوەیە ... لــە وانـەبێ کـە شـتێکی تـازە بابەت بێت، ئەوە نیە کە تەورات لە (اصحاحی ئەستێر)دا دەگێڕێتەوە کە: "موردەخای کاهنیان کچە مامەکەی خۆی کە ناوی (ئەستێر) بووە، ناردیە کۆشکی پادشای فـارس، بۆ ئەوەی بتوانن تۆڵە لە دوژمنانیان بسێننەوە، ئەستێرەش کە کچێکی جوانو ژیـرو لێ هاتوو بوو، توانی بە هۆی جوانی لـەشو لارە سـەرنج ڕاکێشـەکەی زاڵ بێـت بەسـەر کیسرادا، وای لێ بکات کــە فـەرمانێك دەربکـات بـۆ کوشـتنی گشـت دوژمنـەکانی جولەکە، و مردەخای وەزیرێکی بۆ کیسرا دەمەزراند لەسەر ولاتدا بە نــاوی (ئـەحرو بروش)[٣٧]

# چی دەزانی دەربارەی راگەیاندنی ماسۆنی؟

ماسۆنیەت ئەو رێکخراوە نهێنی‌یەیە لە هەندێ وڵاتانداو، ئاشکرایە لە هەندێ وڵاتی‌تردا، جێی وەبیر هێنانەوەیــە، تەلــەفزیۆنی جــەزیرە هــەندێك لــە نهێنی‌یــەكان و ترسناكیەتی ئەو رێكخراوەی ئاشكرا كرد، كە لــەو رێكخراوەیــە هەڵســاوە بــە چــەند كارێكی راگەیاندنی پڕ لە فێڵ پیلان بۆ روخــاندنی ئــایینی ئیســلام لــەناوەوە، زۆربــەی ئامانج و مەرامەكانیان شاردۆتەوەو رەگ و رەچەڵەكی ئەو رێكخراوەیــە بــە كۆنــترین كۆمەڵەی نهێنی دادەنرێت كە تا ئێستاش كار دەكات، ئوصول و پرۆگرامی دەگەرێتەوە بــۆ كۆمەڵــەی رۆمــانی و كۆمــەڵی وەستایانی چــــەرخانی ناوەراســـت و، پرانســـیپە فەلسەفیەكەیان لە رێنمایەكانی بەتریقەكان و نهێنیەكانی بــت پەرستــانەوە وەرگــیراوە. بەڵام سەرچاوەكەیان كەپێی دەڵێن (القبالا) ئەوەی روون كــردەوە كــە لــە بنــەرەتدا جوولەكەیەو بە عیبری مانای (داب و نەریت) دەبەخشێ وپێك هاتوە لــە ئاوێتەیــەكی فەلسەفی و رێنومایی و بەرەڵلایی و سیحر ...... لە هێمایەكانیشــیان، ((حــیرام))ە كــە ماسۆنیەت، بە پیرۆزی دەزانن و هەروەها ئەو پەرستگایەی كە دروستی كردوە شــتێكی پیرۆزە لایان كە سەر بەگروپی وەستاكان بووە لە دروست كردنی هەیكەلی سلێمان لە قودس هەروەك تورات بە (محرقە) زەعمی دەكات. ماسۆنیەتیش هێماو پلــە و نیشــانە و بیروباوەریان فیرعەونیە بەڵام لە رێگای بەنی ئیسرائیلەوە بۆیان گواستراوەتەوە ...

وە لە دیارترین ئامانجــەكانی ماســۆنیەت لــەناو بردنــی گشــت ئایینەكانــە بــە تێكرایی، هەروەك لە بڵاوكــراوەی مەحفــەلی گــەورەی فەرەنســیدا هــاتووە لــە ســاڵی ١٩٢٢ (١٩٨) و دەڵێ: ((ئەی برایان: پێویستە تێبكۆشین بە هــەوڵێكی گــەورەتر لــە پێناو بەردەوام بوونی یاسا و سیستەمی (نا ئایینی) چونكە ئەو دەســەڵاتە رەهــا (الســلطة المطلقة)یەی كە پیاوانی ئایینی دروستیان كردووە لە ســەراپای جیــهان دا لــە كۆتــایی

نزيك بۆتەوە، بەڵكو خەريكە لەناو دەچێت، ئامانج و مەبەستيشمان بەر لە هەموو شتێك لەناوبردن و قەلاچۆ كردنی ئايينەكانە))[٣٨]

وە دەربارەی رۆڵی ماسۆنيەت لە گەندەڵ كردنی ئافرەت لەو لێشاوە فليمانە وە ديار دەكەوێت كە كەسانی سەر بەو رێكخراوەيە بەرهەميان دێنن.

د. محسن عبدالحميد دەڵێ: ((زۆرم خوێندنەوە دەربارەی ماسۆنيەت و ئەرك و كارە نهێنی و ئاشراكانيان و گەيشتم بەو قەناعەتەی كە زۆربەی ئەكتەرەكان بە (ئافرەت و پياو) و ئەوانەی لە بزاڤی هونەری ميسری‌دا كاردەكەن هەر لە بيستەكانەوە تا شەستەكان بەلايەنی كەمەوە - خزابوونە ناو كۆمەڵەی هونەری ميسری ماسۆنی، بەڵكو بۆ زياتر دڵنيايی من خۆم (لافيتە)يەكی سەر بەهەمان رێكخراوم بينی بە هەمان ناونيشان لەسەر يەكێ لە تەلارە كۆنەكانی قاهيرەدا لە ساڵی ١٩٦٥ لە كاتی خوێندنم لە ميسردا.[٣٩]

وە هەروەها دەڵێ: ((ئەگەر بێين بە بێ لايەنيەكی تەواو، لە باری ئافرەت بكۆڵينەوە لەوەی بۆی پلانرێژ كراوە لە جيهانی ئيسلاميدا و كە چۆن گەيشتون بەو چارەنووسە خەمبارە، بۆمان روون دەبێتەوە كە تەنها كۆمەڵەكانی ماسۆنيەت بەكار تێكردنی نهێنی و ئاشكرا لە گشت دەزگا كۆمەڵايەتيەكاندا، لە دوای ئەو كارانە بوونەو بەو ئاكامەی گەياندوە، يەكەم جار لە توركيا و دووهەميش لە ميسر، لەوێشەوە ئەو گەندەڵيە بلاوبۆتەوە لە فيكر و هەتك كردنی ئابڕودا)) [٤٠]

وە لە جۆرەكانی گومڕا كردن لەلايەن راگەياندنی ماسۆنی ئەوەيە كە لە نووسينەكان واگەياندنياندا ئەوە دەر دەخەن كە دەزگايەكە بۆ چاكە بەخشين بە مرۆڤايەتی و پێش كەوتن كار دەكات و، ئامانجيش گەران بەدوای راستيەكانە دوور لە دەمارگيری و لاسايی كردنەوەو دەستە و ئەژنۆيی، و هەوڵ دەدات بۆ يەكبوونی مرۆڤايەتی‌يەكی قوڵ و پتەوو دامەزراو لەسەر بنچينەی لێبوردن و رێز گرتنی مافی مرۆڤ و سەربەستی بيروباوەر. و ئەو كەسەی دەچێتە ناو ئەو رێكخراوەيە دوور

دەکەوێتەوە لە پەرۆشی‌ی لەسەر ئایینی و مەزهەبی کە بە هۆیەکی سەرەکی دەزانێت بۆ تەنینەوەی ناکۆکی و دووبەرەکایەتی، بۆیە قەدەغەکراوە لەسەر شوێن کەوتوانی لە چوونە ناو هیچ گفتوگۆیەکی ئایینی و، فەرمانی پێ‌کراوە بە پەیڕەو کردنی یاسا و سیستەمی رەچاو کردنی وڵات ... لە راستیدا ماسۆنیەت کار دەکات لە پێناو گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی جوولەکە، جوولەکەش بینی کە باشترین فاکتەر بۆ لێدان و لەناو بردنی ئایینەکان، ماسۆنیەتەو مێژووی هەر یەکدیان دەگەڕێتەوە بۆ ٥٠٠٠ ساڵ و دروشمی هەردوو کیشیان ئەستێرەی داودی شەش لایەنەیە، هەروەها جوولەکە و ماسۆنیەکان وا زەعم دەکەن کە ئەوان رۆڵە روحیەکانی قوربانگەی (بناة)ی هەیکەلی سلیمانن.

و خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ماسۆنیەت و جوولەکەدا هەیە لە شێواندنی بەها باڵا ئایینەکانو، کەم کردنەوەی پلەو پایە و ناشتنی تۆی بەش بەشانێ‌ی تایەفی و قوڵ کردنی بەگژداچوونە ناوەخۆییەکان .. لەناو گەلانیدا ... جوولەکەش رێژەیەکی بەرزی هەیە لە تایەفەی ماسۆنی دا ...

مەحفەلی ماسۆنی ئەمەریکی گۆنگرەیەکی بەست و، پێنج لە جوولەکەکانی ملیۆنێر بڕیاریان دا لەسەر نەمانی روسیای قەیسەری بە بەخشینی یەك ملیار دۆلار و قوربانیدانی ١٠٠٠٠٠٠ یەك ملیۆن جوولەکەبۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش لە روسیادا. ئەو پێنج کەسەی کە پارەکەیان بەخشی ئەمانەن: ئیسحاق موتیر، وسیستەر ، ولیفی ، ورون و ستیف ، پارەکەشیان تەرخان کرابوو بۆ پرۆپاگندە و هاندانی رۆژنامەگەری جیهانی دژ بە قەیسەر لە ئاکامی ئەو کوشتارەی کە قەیسەر نایەوە دژ بە جوولەکەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم.[٤١] بەراشکاوی ماسۆنیەت جەختی لەسەر ئەوە کردوە کە دژ بە قەومیەتەو (امم)یەتی ئاشکرا کرد ... و کارل مارکس و ئەنجلس هەردوو کیان ماسۆنین لە پلەی سی‌و یەکەمدا و سەر بە مەحفەلی ئینگلیزین، و

هەردووكیان ماسۆنیەتی نهێنیان بــەڕێوە دەبــرد و كــە ڕۆڵێكــی بــەرچاوی هــەبوو لــە ڕاگەیاندنی بەیانە بەناوبانگەكەی كۆمەنیست ...

ماسۆنیەت كۆمەڵەی سەرمایەدار و دەوڵەمەندانە و وا خۆیان دەیننــە بــەرچاو كە سەربازی دیموكراسین، وەكو كۆنگــرەی (الشــرق الأعظــم) ســاڵی ١٩٠٤ لاپــەرە ٤٣٢ ئەوەی روون كردەوە، كە گشت مەحفەلەكانی ماسۆنیەت كە ١٤٠ مەحفــەلن و سەر بە (شرق الأعظم)ن، ئەوان رای گشتی ئامادە دەكەن و هەڵبژاردنــەكان بــەڕێوە دەبەن و بەم پێیە پەرلەمانی ئەو دەوڵەتانەی بانگێشتەی دیموكراسی دەكەن مل كــەچن بۆ ویستەكانی ماسۆنیەت و ئەمەش یاریی ماسۆنیەتە، و دەبێ رژێمەكانی دیموكراسیی دژ بە ئاین، وا كار بكەن..

## ڕاگەیاندنی ماسۆنی

## لە وڵاتانی موسڵمانان و بەرووبوومە دزێوەكانیان

لەو شێوە ڕاگەیاندنانــەی ماســۆنیەت كــە ئاكــامێكی باشــیان وەدەســت هێنــا لەبەرهەم هێنانی بەرهەمی گەندەڵی لە وڵاتانی موسڵماندا لەوەی كە ماسۆنەیەت بڵاوی دەكردەوە لەو وڵاتانەی لە ژێر فەرمانڕەوایەتی حوكمی عوسمانیدا بوون، لە پرۆپاگندەو درۆو گــەورەكردنی ئــەو هەڵانــەی كــە لــە حوكمــدا هــەبوون ئــەویش، لــە ڕێگــای مەحفەلەكانیانەوە لە (سلانیك)دا كە دوو مەحفەلی تیــا بــوو: مەحفــەلی مــەقدونیا كــە جوولەكە ئیتاڵیەكانی دەگرتەوە لە سەروشیانەوە عەمانۆئیل قەرەســو، و مەحفــەلی la bore tlux ، و مەحفەلی لیــسپانی بــەناوی persevernza و یــەكێكی تریــش لــەگریكی (یۆنانی) بەناوی philippos... كەسانی سەر بەو مەحفەلانە توانیان سەر كەوتوو بن لــە بڵاوكردنەوەی پرۆپاگندەی كاریگــەر، بــە تایبــەتیش مەحفــەلی ماســۆنی مــەقدۆنی لــە دروست كردنی هەڵبەستراو و درۆ لەسەر ئەوەی كە دەوڵەتی عوســمانی چەوســێنەرەو

سەربەستی تیا نیە و ئازاری نەیارەکانی دەدا لەو جۆرە شتانە، تا وایان لە خەڵك كرد كە ئیتر نەتوانن شتی راست لە هەڵە جیا بكەنەوە یان هەق لە باگل، وكاری كردە سەر شۆرشگێران و بانگخوازانی و چاكە خوازانی، نوێخوازانی بەكارهێنان لەسەر شێوازی رۆژئاوا لەژێر ناوی شارستانیەت و پێش كەوتن و، لەو جۆرە ووشانە، كە ئێستاش لەگەڵ دا بێت هەندێ كەس بەكاریان دێنن بە بەكارهێنانێكی گومان لێكراو بۆ ئەوەی لە كۆمەڵگەی ئیسلام بدات و جیاوازی و ناكۆكی بخاتە نێوان موسڵمانان، و دابەش كردنی و پۆل پۆل كردنی خەڵك لەسەر ئەم بنچینەیە نەك بنچینەی ئیمان و تەقواو كاری چاكە و سوود بەخش.

بەراستی درۆینە تالەكەی ئەو راگەیاندنە، رووخاندنی لەو شورەیە بوو كە پارێزگاری لە سنووری ولاتی موسڵمانان دەكرد بە لاوازی كەلێنداریەكەی، دواتریش جۆرە چەوساندنەوەیەكی‌تر سەری هەڵدا كە زۆر درندەتر بوو لەوەی پێش خۆی كە ماسۆنی بوو، لەمجارەیان بەناوی (عەلمانیەت)ەوە كە بەجارێ ئازاری گەلانی داوە، نەتەوەكان دەچەوسێنێتەوە، هیچ یەكێكیش لەو دروشمانەی كە ماسۆنی بەرزیانی كردبووەوە لە ئازادی، یەكسانی، برایەتی گشت مرۆڤایەتی و ئاشتی‌یەكی جیهانی بوو.

جەنەراڵ رفعت ئاڵكخان، هۆیەكانی سەركەوتنی لەو پرۆپاگندانە دەگەڕێنێتەوە بۆ زاڵ بوونی ماسۆنیەت بەسەر هۆكارەكانی راگەیاندن و چاپ، زاڵ بوونێكی رەها و بێ هاوتا، ئەمە جگە لە بوونی دەسەلاتیان لە بانگ و شوێنەكانی تایبەت بە پارەو هەروەها لاوازی پەیوەندی نێوان موسڵمانان و پەرت و بلاو بوونیان و فریو خواردنیان بە راگەیاندنی بلاوە بوونی وشەی هەنگوین كراوی ناو بۆش و كلۆڵ و پروپاگندە مەبەست داری تێكدەر ... پلانی بۆ گەن ... وەرگرتنی یارمەتی گومان لێكراو كە لایەنی ماسۆنیەكان پێش كەشیان دەكرد بە مەبەستی وە دەست هێنان و كەسب كردنی گەنج و سەركردەو نووسەرەكان.

## راگەیاندنی رۆژئاوا

## متمانەمان بە ناسنامەو مێژوومان وون دەکات

هەمیشە راگەیاندنی رۆژئاوای هاچەرخ کاری کـردوە لـە پێناو گـریّ دانـی رابوونی زانستی و راگەیاندنی هاوچەرخ بەخۆیەوە، ئەمــەش بەشێکە لــە هەوڵــەکانی وون کردنی متمانەی باوەڕدار بە ناسنامەو ئاین و نەوەو مێژووەکەی، ئــەوەش دەستی پێ‌کردوە لەگـەڵ هەوڵــەکانی جوولەکـەو خـاچ پەرسـتەکان بـۆ هەڵچوەشـاندنەوەی یەکێتی موسڵمانان و لەناوبردنی ئەو دەسکەوتە زانستیانەی بڕواداران، وە هەرگیز خۆ بەزل زانی (رۆژئاوا)، روخانی (قوستەنتینیە) لەبیر ناکات لە سـەر دەسـتی سـەرکردەی موسڵمانان (محمد الفاتح) کە دەرگای ئەوروپای خستە سەر پشت لەبـەر دەم ئیسـلام دا، بۆیە بە هەموو شێوەیەك کاری کرد بۆ لێك هەڵوەشاندنەوەی ئەو وڵاتانەی کە لــە ژێر چەتری دەوڵەتی عوسمانی دابوون، و ((سەد پرۆژەیان دارِشت بــۆ دابـەش کردنـی تورکیا، و لەساڵی ١٩٢٤ خیلافەت بەرەسمی لادراو داگیرکەران، پێیان نایە ناو خاکی موسڵمانان و زۆربەی گەوهــەرە بەنرخـەکانیان بـەتاڵان بـرد ... کـە ئێسـتا، وان لــە مۆزەخانەی بەریتانیا و مۆزەخانەی لۆڤـەر و کتێبخانـەکانی فەرەنسـادا، و نـاپلیۆن بـۆ نموونە، هەڵسـا بە کوشتنی پێنج تا شەش زانـا، لــە باشـترین و دانـا ترینیـان، رۆژانـە و هەڵواسینی سەریان بەسەر رمەوە و گەڕاندنیان بەناو کوچە و شەقامەکانی قاهـیرەدا، و هەر لەگەڵ هاتنی بۆ ناو میسر گشت ئەندازیارو هونەرمەندەکانی خستنە ژێـر فـەرمانی راستەو خۆی، خۆی و زاناکانیشی بــە زۆر خسـتنە ژێـر فەرمانڕەوایـەتی خـۆی و لــە چادرگایەکی زۆرە ملی نیشتەجێ کردن و هەروەکو (جبرتی) دەڵێ ((بۆ بەرێوەبەران و فەلەکناسان، خەڵکی شارەزا، زانست و بیرکاری وەك ئەندازەزانی و نەخشە و نیگـار، وێنەکێشان و وێنە گران و نووســەران و ژمێریـاران: گـەڕەکێکی بـۆ تـەرخان کـردن

بەناوی (ناصریه) ، بۆ ئەوەی تیایدا کۆببنەوەو لە کاتی پێویست لەژێر فرمانی ئەواندا بن)[٤٢]

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خوێندوە عەلمانیە دزیکارە هات بۆ ئەوەی لە راگەیاندنەوە، رابگەیەنێ کە ئیسلام دواکەوتن پەروەردە دەکات و رۆژئاواشدا، خاوەن بلاوبوونەوەی شارستانیەت و پێش کەوتنە، بۆ نموونە، استنبول هەر لە ساڵی ١٧٢٨ز چاپخانەی ناسیوە و بەکاری هێناوە لەگەڵ ئەوەشدا سەرپەرشتیارانی چاپخانە ناپلیۆنیان کرد بە هێمای شارستانیەت و تاکە بەرهەم هێنەری بابەتی نووسین و خوێندنەوە!

## ئەم پەلامارەی راگەیاندنە کێ بەرپەچی دەداتەوە؟

راگەیاندنی ئەمەریکایی و رۆژئاوا و مارکسی و بگرە بوزی و هیندوکی باڵیان کێشاوە بەسەر کات و رووبەرێکی فراوانی راگەیاندن لە وڵاتانی موسڵمانان بە نەگونجان و نارێکییان لەگەڵ زۆربەی ئوصول و بڕواو جێگیر و رەوشتەکاندا، و دروست کردنی شوێنەوارێکی نابەجێ و بەد لەم رووەوە.

وە فیلمە سینەماییەکان و بەتایبەتیش فیلمی ئەمریکایی کە بۆتە پێشکەوتوترینی فیلمەکان لە رووی هونەریەوە، ئامێرێکی مل کەچی پەخش کردنی بیرو بۆچوون و داب و نەریتی ئەمەریکاییە، کە گەلان سڕ دەکات و دووریان دەخاتەوە لە هیواو تاوانەکانیان و نقومی گێژەنەیەکی بەهێزی جنس و توندو تیژی و خراپەکاری دەکات، بەو رادەیەی کە هەندێ لەو فیلمانەی بە تایبەتی بۆ وڵاتە ژێر دەستەو دۆڕاوەکان بەرهەم دەهێنرێن، لە ناو خودی ئەمەریکا نمایش ناکرێن.

هەروەها فیلمی ئەمەریکی وا وێنە دەگێردرێت کە زل هێزی و گەورەیی ئەمەریکا و سەربازەکان بە جۆرێك بخاتە بەرچاوان کە هەرگیز نابەزێندرێت، ئەوەش بە مەبەستی سەلماندن و بەرەسەن کردنی پرنسیپی (ئەمەریکا گەورە جیهان)ە، ئەمە وێڕای

دەناڵێنێ، و لە هێنانی (استراد) شێوازی ڕۆژئاوایی لــە جۆری ڕابــواردن و دڵ خــۆش کەرەکان کە بە هیچ شێوەیەك پابەندی ئیسلام و ئەحکامەکانی نابێت و پڕۆپــاگندە بــۆ بیرۆکەکانی ڕۆژئــاوا دەکـات و ســەرنج و سەرســورمان بــەرەو ژیــانی ئــەو بیرۆکانــە دروست دەکات، ئەمەش دەبێتە فاکتەرێك بۆ وازهێنان لە زۆربەی شــێوازەکانی ژیــانی ئیسلامیانە و ڕاگەیاندنی یاخی بوون لێیەوە، یان پەنا بردنە بەر ڕۆژئاوا بــە ژمارەیــەکی زۆر و بێ بەش کردنی وڵات لە بەهرەمەندی کۆچکارانی شەیدای ڕابــواردن و ســامان کۆکردنەوەو گەڕان بە دوای ئاسایش و ئارامیەکی وون بوو لــە وڵاتــانی کوفــرو جــێ هێشتنی گیروگرفتە درێژ خایەنەکان و چارەنووسێکی پــڕ لــە ئێــش ئــازاری خــێزانی و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی، بە جۆرێك حاڵەتە کەوای لێ هاتووە کە ئافرەت بەتەنها بــەرەو هەندەران وەرێ بکەوێت و دووچاری جۆرەها مەترسی بێتەوە، ئەمە وێڕای ئەوەی کــە ئەوانەی بەرەو هەندەران دەڕۆن دووچاری کرداری بە دیان بوون (التنصیر) دەبنەوە و ئیستغلال دەکرێن و ناچار دەکرێن کە هەستن بە چەند پیشەیەکی ســوك و نالــەبار کــە نەگونجاوبێت لەگەڵ ئایین و ڕەوشت و داب و نەریتی.

وە ئەگەر بێت و ئــەو لێشــاوەی کــۆچ کردنــە بــەردەوام بێــت، ئــەوا وڵات هەڕەشەی کەم بوونەوەی ژمــارەی دانیشــتوانی لێ دەکرێــت بــە شــێوەیەکی ســامناك، هەروەها لە کاریگەریەکانی ئەو ڕاگەیاندنەی کە بۆمان ڕەوانە دەکرێت بەو شــێوەیەی کە ئێستا هەیە، ئەوا دەبێتە مایەی نەمانی ڕق لێبوونەی بــڕوادار لــە کــاری نــا پەســند (منکر) و فسق و لادان و ستەم و ستەمکاری ... لەو کاتە و ڕاگەیاندنەکانی ڕۆژئــاوا، ستەمکار لە شێوەی شارستانەیەتو پێش کەوتوونمایش دەکات و لەهەمان کاتدا ســتەم لێکراو بە دوا کەوتوو ساویلکە توندڕەو، ئارەزوو پەرست و لــە چەرخــەکانی کۆنــدا دەژین هتد ...

بێ گومان بینەر لەگەڵ ئەو کەش و هەوایە لێ ڕادێ و تێکــەڵ دەبێــت لەگــەڵ ڕیزەکانی پاڵەوانانی تەمسیلیەکە ... ئەوەی ئەو هەموو دیمەنانە بەرۆژ ببینێت ئــەوا زۆر

دەنگ دانی هەلدێ لەو فیلمانـــە بـۆ بـیرو بۆچوونـەکانی زایۆنـیزم وەگـەڕ دەخرێـن، جوولەکـەش بەلایـــەنی کەمـــەوە خـــاوەن نزیکـــەی ٢٤٤ رۆژنامـــەن لـــە ولاتــە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، لەوانە (١٥٨)یـان وەرزیـن، سـی (٣٠)ی وەرزیـش لـە کەنەدا، و ١١٨ رۆژنامە لـە ئەمەریکای لاتینـی، ٣٤٨ وەرزی و گۆڤـار لـە ئـەورووپا، وخاوەنـە گـەورەکانی رۆژنامـەو پـاوانی بازرگـانی جوولـەکـە هـەوڵ و تەقەلایـــەکی بێووچـان دەدەن بـۆ کڕینـی رۆژنامـە و ئێسـتگەی رادیـۆو تەلـەفزیۆن، لـە ولاتـانی ئەورووپای رۆژ هەلات، هەر هەموو ئەو هۆکارانەی راگەیاندن باس وهـــاتوو هـاوار بـۆ جوولەکەو شارستانیەتو دەستکەوتە مەزعومەکانیان دەکــەن و، لەولاشـەوە هـەوڵی چەسپاندنی بیرۆکەی دواکەوتوویی موسڵمانان دەکەن و بە تیرۆرست و ناکۆك لەگـەڵ یەکتری دەیانخەنە بەرچاو.

وە لە پێناسە کردنی راگەیاندنی رۆژئاواو جولـەکە بـۆ راگـەیاندن لـە ولاتـی موسـڵماندا: بەسیاســەت کردنـی راگـەیاندنی ناوخۆیـە بـۆ ژێــر دەســتە کردنـــی و هەڵسوراندنی لە پێناو مەرامەکانی دەسەلاتی سیاسی و جەخت کـردن لـەســەر دەنـگ وبـاس و لـەو بەرنامانـەو بەرهەمـە راگەیاندنانـەی کـە پـڕ درێـژە دەدەن بەمانــەوەی دەسەلات، و دەوڵـەت و شـەرعیەت دەدەن بە رژێم و دەست دەخاتە نــاو کـارو بـاری خەڵك و بەشێوەیەکی خورتی (قهری)، بۆیە بەکرێگیراو و لاسایی کەرەوە و دەلالـەکان لە پێشەنگی ئەوانەن کە کاری تیا دەکەن.

وە لــە کاریگەریـەکانی تـری ئەوەیـە، بـەرەو زیـاد چوونـــی دامـــەزراندنی فەرمانبەران لە بوارە تەرفیهیەکان و هۆکارەکانی راگەیاندنی بینین و بیستن، رۆژ بەرۆژ لـە پەرەسەندن دان بەجۆرێك لـە فەرمانبەرایەتیــەکانی تـری تێپـەڕاندوە، و گۆڕەپـان و رووبەرێکی فراوانـی داگـیر کـردووە، لــەو کاتـەی نەتەوەکـەمان زیـاتر پێویسـتی بـە بەرنامەی ئاراستە کراوی ئیمانی و فیکری و کۆمەڵایـەتی رەســەن هەیـە کـە رزگـاری بکات لە باری شوێن کەوتن و لاســایی کردنـەوەو لـەو لاوازیـەی کـە بـە دەسـتیەوە

دەگمەنە ئەو جۆرە کەسانە ئیتر بتوانن هەڵسن بەکاری ﴿الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر﴾.

## مارشێت نووسین
## بۆ دەستکەوتەکانی تاکە کەسی و حیزبی لە راگەیاندا

لە دەردە کوشندەکانی راگەیاندنی هاوچەرخ، گەورە کردن و گرنگی دانە بە (من)ی خۆ بەشت زان (الأنا)ی تاکە کەسی و تایەفی و رەگەز پەرستی و چینایەتی، ئەویش بە درێژە پێدان لە باس کردنی دەستکەوت و کارەکان و تایبەتمەندیەکانی کەسێك یان کۆمەڵێك کە پیَی هەڵدەستن و ئەنجامی دەدەن لەگەڵ سواق دانی هەڵە و کەم و کورتیەکانی یان بەرگ دەبەر کردنی و هەندێ جارانیش بەرگریشی لێدەکرێ و (شرعیاً)یشی بۆ دادەرێژن. لەلایەکیترەوە کەم و کورتیەکانی یەکێکیتر ئاشکرا دەکەن و چاکەو چاکەکاریەکانی دادەپۆشن و هەڵ خلیسکانەکانی گەورە دەکرێن و هەر کاتێکیش هەڵی بۆ رەخسا ئەوا ئاماژە بە کەم تەرخەمیەکانی دەکرێت ...

ناوەرۆکی ئەو جۆرە کردەوە راگەیاندنە روخساری ریابازی وەردەگرێت هەندێ جار، سەرسام بوون و خۆبە زل زانین، و خەڵك بەگێل دانان و پشت گوێ خستنی مافەکانیان و سوکایەتی پێ کردن بە کارەکانیان و فەرامۆش کردنی پلەو پایە نیجابیەکانیان. بەراشکاوی قورئانی پیرۆز، جەخت دەکات لەسەر پێویستی پاك کردنەوەی دەروونی ئیماندار و ئەو کەسەی بەکاری راگەیاندن هەڵدەسێ و فێربوونی دڵسۆزی، ریابازی لە پەرستشەکاندا و رێبازی داناوە بە هاوبەش پەیداکردنێکی (شرك) شاراوە داناوە، کە پێویستە قەلاچۆ بکرێت و شوێن رەگە قووڵەکانیدا بگەرێین لەناو چینەکانی دەروونی مرۆڤدا.

کەچی بەرپەچدانــەوەی ئــەو شــتانەی گومانیــان لیّ دەکریّــت و بــۆ هەڵبەســتراوەکانی ئاراستە کراوە لەرێگای راگەیاندنەوە بۆ بڕواداران ئــەوا ئاشـکرا دەکریّــن و وەلامیــان دەدرێنەوە بەشێوەیەکی زانستیانە و دەستپاکی بەبێ زیادڕەوی پڕۆپاگــەندە، یــان زیــادە بەسەرەوەنانی کاری ئەو کەسانە دەبینن کە نازناوی چاکە خوازی دەدەنە پاڵ خۆیان.
هەروەکو خوای بالاّ دەست دەفەرموویّت: ﴿وَقُلْ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُــولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾(التوبه/١٠٥)

## مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە لە (راگەیاندن)دا

راگەیاندنی جاهیلی لــە رۆژان و چــەرخی پــەیامی پــیرۆزی ئیســلامدا، پــەنای دەبردە بەر چیرۆك و ئەفسانە مێژووییەکان و، بە شێوەیەکی هونــەری لــەناو خــەڵکیدا بلاّویان دەکردەوە، بۆ ئەوەی کاریگەری قورئان لەسەر دڵەکاندا لابدەن. (نضر کوری الحارث) بە وەفد چــوو بــۆ ولاّتــی فــارس و لــەوێ فــێری چــەند چــیرۆك و هــەواڵ و رووداوێك بوو کە (روستەم و ئەسفەندیار) بۆیان گێڕایەوەو، ئەو زانینەی هەڵقۆزیــەوە بەکاری هێنا لــە لابردنی کاریگەری رەوانیەت و بانگخوازیە ئاشکراکەی قورئان.

ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ)، لــە کۆڕێك هەڵســابوایە و (نضــر کــوری الحــارث)یــش لــەوێ بووایە، ئەو (نضر)ە رووی قسەکانی دەکردە خەڵك و چەند بەشێکی ئەو چیرۆك و ئەفسانەی بۆ دەگێڕانەوە کە فێریــان بیــوو، و دوایــش لــە خەڵکەکــەی دەپرســی و دەیگوت: (توخوا کاممان باشتر چیرۆك دەگێڕینەوە؟ من یا محمد؟ بۆیە ئەو ئایەتە دابەزی کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَــمِعْنَا لَــوْ نَشَــاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَذَا إِنْ هَذَا إِلا أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾(الانفال/٣١)

ئەو هەولــە راگەیاندنانەی دژ بــە ئیســلام، ئێســتاش دەگــەڵ دابێــت دووبــارە دەبنەوە، چونکە دوژمانی ئەم ئاینە بــەردەوامن لەبــەرهەم هێنــانی کــاری ئێســتگەیی و

زنجیره تەلەفزیۆنی و پەخش کردنی فیلم و ئاراستە کردنی بەرنامەی لەو جۆرانەی کە گشت شتێکی رابواردن و چەقە چەق، ئەفسانە، هەڵس و کەوتی بت پەرستانە، و داب و نەریتی جوولەکە و خاچ پەرستان، و چەندەها جۆری فەرهەنگی و، ئەدەبی و، بەرنامەی فیکری و سیاسی و کۆمەلآیەتی هەموشیان، بۆ فریودانی خەڵك و دوور کردنەوەیانە لە خوا، ئەمەش بۆ چەند کاتێکی درێژ کە شەو تیایا دەبێت بە رۆژ ئەو شەوەی کە تایبەت کراوە بۆ حەوانەوەی دڵ و جەستە و، رۆژیش بۆ کار. دوژمنان هەموو ئەو هەولأنە دەدەن تەنها بۆ بەرگری کردنە لە راگەیاندنی پەیامی قورئان و کارە کاریگەریەکەی، وە ئەو کتێبەی کە دابەزێنراوە بۆ رێکخستنی سیستەمی ژیان بە شەریعەت و پێوەرو چیرۆك و نموونە و سنوورەکانیەوە، کراوە بە شتێك تەنها بۆ خوێندنەوە بێت و پەخشی رادیۆو تەلەفزیۆنی پێ بکرێتەوە و ئاهەنگەکانی پێ پیرۆز بکرێت! کە لە بنەڕەتدا ئەو جۆرە ئاهەنگانە کە ساز دەکرێن بۆ دوور خستنەوەی خەڵکە لە قورئان و مەنهەجیەتی قورئان و بەهێز کردنی رژێم و بارو دۆخێکی وا کە پێچەوانەی بەرنامەی قورئان بێت ... بێ ئەوەی تەفسیرێکی لەبارو لێ تێگەیشتنووی بۆ بکرێت لە بیرو بۆ چوونیان، قورئان کراوەیە کتێبێك دوعاو نووشتەی لەبەر دەنووسرێتەوە و لەسەر مردوەکان دەخوێندرێتەوە نەك، زیندوەکان، کەچی لەبواری بەرێوەبردنی خەڵك، دەبێ بە گوێرەی مەزاهیبی مرۆڤکردگان بێت لە دیموکراسی و سەرمایەداری و چەوساندنەوەو رەگەز پەرستی، بە هیچ شێوەکیش ئیسلام لە کارەکانیاندا رەنگ ناداتەوە.

هەروەها کڕینی تەلەفزیۆن بۆ خەڵکی ئاسان دەکەن و لەوانەیە جارجار هەر بە خۆڕایی بەسەریاندا دابەش بکرێت بۆ ئەوەی فەسادیان بکەن و بیان توێننەوە و دووریان خەنەوە لە ئیسلام و بارەڕ، بە (دين الملك) بێنن و مل کەچی بیرو بۆ چوونی دەسەلأت بن و، گوێرایەڵی بەرپرسانی حوکمێك بن کە ئەو حوکمە نەبێت، کە خوا ناردویەتی، و نرخی (سەتەلایت) هەرزان دەکرێت بۆ ئەوەی بچێتە گشت ماڵێك و

هانی خەڵکی دەدرێت بۆ کڕینی (گومرگی لەسەر نییە) بۆ ئەوەی بتوانن بە ئاسانی ڕەوشت لە ناوبەرن و ئەو برە ئیمانەی کە ماوە نەی هێڵن لە رێگای فیلمی جنسی و دیمە رووتەکانی و ئەو موسەلسەلانەی ناپاکی ژن و مێردایەتی نمایش دەکەن و بەرەواشی دەزانێ و پەیوەندی دەبەستێ لەگەڵ کەسانیتر لەسەر توندو تیژی و بەگژداچوون و هێز موسڵمانانیش بەگشتی و تێکرایی ناودەبەن بە (جیهانی سێیەم)ی داواکەتوو، ئەمەریکاو ئەورووپا بە جیهانێکی پێش کەوتوو و شارستانیەت. شتێکی روون و ئاشکرایە کە ڕاگەیاندن لە گشت وڵاتانی جیهاندا، بە گوێرەی بەرنامەیەکی روون و، سیاسەتێکی داڕێژراوی دیاری کراو بەرێوە دەچێت، ڕاگەیاندنی سۆشیالیزم هەوڵی چەسپاندنی بیرۆکەی سۆشیالیزم و سیستەمی مارکسیەت لە مێشکی ئەوانەی کە بەرنامەکانیان بۆ دەچێت و وەری بگرن.

هەروەها ڕاگەیاندنی سەرمایەداری دیموکراتی رۆژئاوایی، ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە فرەلایەنی رەها (التعددية المطلقة) لە بیرو باوەڕ و پرۆپاگندە بۆ سیستەمی رۆژئاوا بۆ مافی مرۆڤ و دانانی بە یاسا دانەر و لەبەر چاوگرتنی ڕاکردن بەدوای ڕابواردن و هێز و سوود و جنس ئامانجێکی تاك و کۆمەڵە ... هەروەها شێوەکانیتری ڕاگەیاندنی وەسەنیەت و هیندۆسی و بوزیش. جوولەکەش پرۆپاگندە بۆ بیرۆکەی گەلخوازی هەڵبژاردراو دەکەن و ئەفسانە بڵاو دەکەنەوەلەسەر ئەوەی کە ئەوان باشتر و ڕەگەزچاکترن لە گەلانیتر و کاری بۆ دەکەن و هەوڵی دروست کردنی کیانی خۆیان دەدەن لەسەر حیسابی نەتەوەکانیتر کە بەچاوێکی نزم سەیریان دەکەن و لەوان نزمترن (جویم)...و...

ئەوەی ڕاستی بێت ڕاگەیاندن لە وڵاتی موسڵماناندا ئێستاش لەگەڵ دابێت ڕوخساری پەیرەو کردنی پرۆگرامی بۆ هەڵبەستنی پێوەدیارە، چونکە ئەو جۆرە ڕاگەیاندنە لەسەردەمی داگیرکەرانی بیانی سەربازی و فیکری بۆ ئەو دەوڵەتانە دامەزراوە. هەر بۆیەشە ئەو دەوڵەتانە ئەو شوێنەوارەیان هەر پێوە دیارە، لە رووی بیرو

چۆنیەتی دەربڕینی و هۆکارو ناوەرۆکەکانیان، هەندێ جار هەوڵی بەستنەوەی کلتور بە هاوچەرخێتی دەدەن، هەندێ جار بانگێشتی نەتەوایەتی رەگەزپەرستی دەکەن، یان بەسەر شان و شەوکەتی سیاستی دەوڵەت دا هەڵ دەڵێن، هەندێ جار پەیڕەوکردنی (جیهان گەری) هەڵدەبژێرن و بەرگری کردن بۆ خۆپاراستن لە راگەیاندنی جیهانی بە شتێکی بێ هودە و ساویلکەیی دەزانن یان پەیوەست بوون بە ئەحکامەکانی ئیسلام رەت دەکەنەوە لەبەرهەمەکانی راگەیاندندا و درۆو لەخشتە بردن بەکار دەهێنن و شتی ناماقوڵی دەکەن بەرامبەر بە ئیسلام و هەوڵی کەم کردنەوەی پلە و پایەی دەدەن چەندین کۆنگرەی جیهانی (ئیسلامی) بەسترا کە هەر هەموویان ئاگاداری توانەوەی راگەیاندن و وون بوونی ناسنامەکەیان دەکرد و بانگێشتی پەیڕەوکردنی ئیسلامیان دەکرد لە هۆکارەکانی راگەیاندنی بینین و بیستندا، سەرکەوتووی وەدەست بێنن لە نێوان پێویستییەکانی خەڵك لەبابەتەکانی راگەیاندن و لەنێوان ئەوەی باوەڕیان پێیەتی لە پێداویستیەکان لە ژیاندنەوەی ژیانێکی ئیمانی هەڵقوڵاو لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و پێگەیاندن و ئامادەکردنی پیاوانی باوەڕدار و لە خواترس و دڵسۆز کە کار بکەن لە بە رەسەن کردنی تەسەوورەکانی ئیسلام لە بوارەکانی ژیاندا و دەنگیان بکەنە یەك (باوەڕداران) بۆ دروست کردنی نەتەوەیەکی یەك پارچەی رزگار کراو لە گیانی رەگەزپەرستی و بیروبۆچوونەکانی هەرێمایەتی تەسك و دەمارگیری کۆمەڵگەی فرەبەشی (الانثی) هۆزایەتی ...[٤٣]

و ئیسلام بکرێت بە یاسادارێژ، لە ژیانی رامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی، و ستۆپ پێکردنی لێشاوی راگەیاندنی دەسەڵاتی بیرو بۆچوونەکانی رۆژئاوا بەسەر موسڵماناندا، و خەباتکردن دژی ئیستکبار و مەترسی جوولەکە کە هەڕەشە لە جیهان دەکات بە بیری رەگەزپەرستی و فراوان خوازی و بەکەم دانانی گەلان ...

هەروەها پێویستە لەسەر راگەیاندنی ئیسلامی کە، بگەڕێن بە شوێن راستگۆیی و هەق و لەو شتانەی کە پەخش دەکرێن و بلاو دەکرێنەوە بە شێوازێکی ئیسلامی

دوور لە دەست تێوەردان و گۆڕانکاری تیا کردن و هەروەها دوور بێت لەسەر کـردن ـ خەریك کردن و لاسای کردنەوە و پارێزگـاری کـردن لـە منـاڵ و نەوجـەوانان لـە ڕاگەیاندنی جنسی و توندو تیژی و ئەفسانەیی و ڕۆژئاوایی، و زۆر گرنگی نـە دان بـە ‌یەنـە دڵخۆشـکەرەکان (الترفيهيـة) و وەرزش و جولێنـەری ئـارەزووی جنسـی کـە ‌ئوێنەوارێکی بەدی جێ هێشتوە لەسەر نەوەی ئێستاماندا کـە زۆر گرنگـی نـادات بـە بنیات نان هەروەکو گرنگی دەدات بە وێنە و گۆرانی! بەڵکو کەش ئامادە دەکـات بـۆ هەڵپەڕین لەسەر جۆرێکی تـەپڵ و دەهـۆڵ‌ڕێـز لـە پـیرو بەسـالاچووان و پەککەوتـە ناگرێت و بەڵکو بەچاوێکی تەسك سەیریان دەکات و دڵ ڕەقیان بەرامبـەر دەنوێنـن و بەکەم سەیریان دەکەن!

## ئەو ڕاگەیاندنە ئیسلامیەی دەمانەوێت کامەیە؟

ئگەرشـێوە جـۆر بـەجۆرەکانی ڕاگـەیاندنی جیـهانی هاوچـەرخ ئـەو هـەموو تایبەتمەندی و ڕوخسارە زیانئاوەرە ڕەنگاو ڕەنگانە وەربگرێت، ئایا پێویست بەوە ناکات کە ئێمەش پلان دابڕێژین بـۆ ڕاگـەیاندنێکی بـاوەڕی پرۆگرامـی و بەرنامـەیی وورد و ڕێك؟ هەروەکو ئاشکرایە کا ئایین گشت شتەکانی بۆ مرۆڤی روون کردۆتەوە و روون دەکاتەوە و سنووریشی بۆ گشت، بوارەکانی ژیانی بەتێرو تەسەلی دیـاری کـردوە کـە ڕێکن لەگەڵ ئەو بنەما باوەڕیەی کە باوەڕی پێیەتی، ئەویش بە وەدیهێنانی بەندایەتیـەی بۆ خوای گەورە (جل جلاله) و بەرجەسـتە کردنـی ڕۆڵـی خیلافـەتی لەسـەر زەوی و ئ وەدان کردنەوەی باوەڕدار کە هەرگیز نابێ ئایینەکەی بکات بـە تەنـها پەیوەندیـەکی دەستی، دروشمی یان ڕەوشتی سنوردار، بەڵکو دەبێ شوێن کـەوتووی ئـایین بێـت، لـە هەموو بوارەکانی ژیانیدا لە فیکری، بازرگانی، رامیـاری، کۆمەڵایـەتی و ڕاگـەیاندن و هونەری بۆ ئەوەی یاسا، گشتی ببێ بەوبەرنامەیەی کە خوا ویستی لەسـەرەو تـا ئـایین گشتی دەبێ بەهی خوا ﴿ليكون الدين كله لله﴾ و لادانی گشت شەرانگێزانەك لە ئایینی

خوادا ... بەتایبەتی ئێستا، کە نەتـــەوەی ئیســلام رووبــەرووی ترســناکترین راگــەیاندن بۆتەوە، کە لـە هیچ سـەردەمێکی رابردوو بە خۆوەی نەبینیوە، کە هـەندێ لایـەنی ئـەو راگەیاندنەمان خستە بەر چاوان ...

بیانی لـە پەلاماردانیدا، پەنا ناباتە بەر سوپا مەگەر بەدەگمەن نەبێت، بەڵکو بـۆ ئاژانسەکانی دەنگ و باس، شی کردنەوەی رۆژنامە گەری، بەرنامە تەلەفزیۆنیە سەرنج راکێشەرەکان و فیلمی کارتۆنی رێك لـە دەرهێنان و نـاوەرۆکدا بـۆ دروسـت کردنـی زەمینەیەکی دیاری کـراو، کاسـێتی ڤیدیـۆ، پەخشـی ئێسـتگەیی بـە مەبەسـتی بـەدیان کردنێکی راستەوخۆ، یان ئامادەکردنی بیرو هـۆش و دەروونـەکان بـۆ وەرگرتنـی ئـەو چارەسەرەیانەی کە ئەو جۆرە راگەیاندنە بلاّوی دەکاتەوە، دوایش رازی بوون بە هاتنی بیانی داگیرکەر و هەسـت نـەکردن بـە هیـچ هەسـتێکی هەڵوێسـت وەرگرتـن و خـۆ لێپارستنی، بەڵکو پـێی سەرسـورمان بـێن! و لــەباوەش گرتنـی نەخشـە و پلانـەکانی جێبەجێ کردنی و هەنگاو هاوێشتن شان بەشانی و بیروبۆچوونەکان و سـەرپێچییەکان و کارە گەندەڵ و نارەواکانی و دوایش، ســەرەنجام، کەوتنـە دوای و گرفتـار بـوون و تووش بوون بە لێتەنینەوەکانی و نەخۆشییەکانی ... نەخشەو پلانەکەش لـەوەوە دەست پێ دەکات پالاّوتنی نامە و وەرگیراوەکانی راگەیاندن و بخرێنـە ژێـر پێـوەری ئیمـانی و پارێزکاری و زانستیی بەردەست (العلم الواقعي) و بیرکردنـەوە و ووردبوونـەوە لــە مەبەست و نیاز و هەوڵەکان و دیاری کردنی هەڵەکان و گەندەڵیـەکانی بەشـێوەیەکی لۆژیکی و سەرژمێریاری و پرۆگرامی دروست و دان پێ هێنـەر بـەهۆکارو پارسـەنگی بەرامبەر، بۆ ئەوەی برواداران و موسڵمانان بـە تێکڕایـی رزگاریـان بێـت لـە ئاکـامی زیانبەخشەکانیان کە کار دەکەنە سەر زۆربەی خەڵك بۆ بەجێ هێشتنی ولاّت و کەس و کار و پرۆژە دونیاییەکان وە پەیوەندیە ئایینیەکانیان بۆ لەوەی لـە رۆژئاوادا بژیت بـە دەردەسەری ...

هەروەکو خوا دەفەرموویت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾(الحجرات/ ٦)
هەروەها دەفەرموویت ﴿وَلا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولا﴾(الاسراء/٣٦)

راگەیاندنی ئیسلامی ئەو راگەیاندنە جوگرافیەیە نیە کە بەرهەم دەهێنرێت لە ولاّتانی موسلّماناندا، وەك پێویست! هەروەکو لێکۆلینەوەی بیانی بۆی دەچێت، و نە ئەو راگەیاندنەیە بەتەواوی کە بەرهەم هاتوە لە مێژووی موسلّمانان لە چەرخە جۆراوجۆرەکانیدا و نوێنەرایەتی شێوەکانی، راگەیاندنی ئیسلامی دیاری کراوی ئێستای گشت راگەیاندنی ئیسلامی ناکات، هەرچەند هەلّوێستی بە چەند هەولّ و بەرهەم هێنانێك کە (جێگای دەست خۆشی لیّ کردنن) و چاکە و خراپەشیان تیا وەدیار دەکەوێت ...، بیرو بۆچوونی جوگرافی خەلّکی وایّ دەگەیەنیّ کە هەمی ئەو شتانەی کە بەرهەم دەهێنرێن لە ولاّتی موسلّماناندا، ئەوا راگەیاندنی ئیسلامی پێویست و چاوەڕوان کراوە ... کە چی واقیعی راگەیاندنی لەو ولاّتانە دووری خۆی وەدیار دەخات لە ئوصولّی ئیمانی و شەرعی، لە زۆربەی پرۆگرام و شێوەکانیدا و ئەوانەی سەرپەرشتی دەکەن، زۆر بە ئاسانی شوێن کەوتنی خۆی ئاشکرا دەکات بۆ شێوازەکانی رۆژئاوا یان رۆژهەلاّت و ناسنامە ئیمانیەکەی وون دەکات کە لە قورئان و سوونەت وەرگیراوە ...، تێروانینی مێژوویی بۆ راگەیاندنی ئیسلامی، تێروانینێکە کە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی و چاوانی بەند دەکات لە مێژوودا، هەندیّجار دەیان گەرێنێتەوە بۆ ئەم سەردەمە بۆ مەبەستێکی بازرگانی، یان هونەری یان وەکار خستنیان لە کاتی پێویستدا و وایان دەینە بەرچاوی بینەران وەك کائنات و بوونەوەرێکی دەخیل لە جیهانی دەرەوەی جیهانی ئێمە وەهاتوون و ناگونجێن لەگەلّ کەش و هەوای ئەم کات و سەردەمە، بۆیە کاریگەری ئەو جۆرە راگەیاندنە، رێژەییە و کەمە، خۆ ئەگەر بێت و رۆلّێکی بەرچاوی سەرنج راکێشەری بەرهەم هێنا، لەوا بیّ هیچ پێشەکییەك دەستی

فەرمانڕەوایەتی دەسڕۆ و هۆکارە ژێر دەستەکان دەکەونە گەڕ و جموجۆڵ بۆ نەهێشتنی ئەو ڕۆڵ و بەرهەمە، چ بە بەکارهێنانی ڕاگەیاندنی هێرش کەر بێت یان هەر بەچەوساندنەوەو تۆقاندنی ڕاستەخۆ و ڕاونانی ئەو کەسانەی کە شتەکەیان بە هەند و جەدی وەرگرتوە هەروەك ئەوەی بیەوێت شوێن کەوتووی پێغەمبەر بێت (ﷺ)، بەو شێوەیەی کە پێویستە یان هاوەڵەکانی، ڕەزای خوایان لێ بێت، دوای بینینی کاریگەری فیلمێکی وەك (الرسالە) یان جۆرە خۆ ئامادە کردنێکی هەبێت لە ناخەوە بۆ جیهاد و ئەو فەرمانانەی دەهێنرێتەوە یاد و دوای بینینی‌یەکی‌بە پەرۆشەوەی فیلمێك کە باسی جیهاد و خۆبەخت کردنی موسڵمانان بکات لە مێژووی کۆن و تازەدا ... ویان شوێن سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوێت، ئەوا بە کۆنە پەرست و رابردوو و مێژوو پەرست دادەنرێت و بە شتێکی بێ بەها سەیری دەکرێت و تەنگی پێ هەڵدەچنرێت بۆ ئەوەی وازی لێ بهێنێ.

بەڵام لە ڕوانگەی واقیعی ڕاگەیاندنی ئیسلامی‌یەوە کە پرۆگرامەکانی بەرێوە دەبات، بەگوێرەی ئەوەی کە تا ئێستا بەرهەم هاتووە یان لەو نامە ڕاگەیاندنانەوە کە نێردراون ئەویش پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە، چونکە هەر هەموو بەرهەمی پەخش کراو ڕێك و تەرتیب نین لەگەڵ ئەحکامە ئیسلامیە دروستەکان، بگرە هەندێ فەتوای نەرم شێواز و هەندێ حاڵەتی سنوور بەزاندن، شوێنەوارەکەی دیارە بەسەر ئەو ڕاگەیاندنانەدا، ئەویش بە کار تێکردنی ڕاگەیاندنی هاتوو یان هەڵبەزودابەزی دەروونی و بیروڕای بەرگ کراو بە بەرگی ئایینی و نرخێکی کەمی پێ وەدەست دێنن.

## راگەیاندن بەگوێرەی ئارەزووەکان دروست نابێ

لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە، کە لەکاتی راگەیاندنی پەیامی ئیسلامدا دووچاری جۆرەها ئازارو ئەشکەنجە هاتووە هەروەکو دەفەرمووێت (ﷺ) ((لقد أوذيت في الله وما يؤذى احد واخفت في الله وما يخاف احد ...))

واتە: ئەوەندە ئازاردراوم کە کەس بەو شێوەیە ئازار نەدرابێت، ئەوەندە ترسێندراوم کە کەس ئاوەها نەترسێندرێت و نەترسێندرابێت.

وە بوخاریش ئەوەی تەخریج کردوە لە عەروەی کوڕی زوبەیرەوە (( سالت بن العاص فقلت: اخبرني باشد شيئ صنعه المشركون برسول الله (ﷺ)؟ قال: بينما النبي (ﷺ) يصلي في حجر الكعبة، اذا اقبل عليه عقبة بن ابي معيط، فوضع ثوبه في عنقه، فخنقه خنقاً شديداً، فاقبل ابو بكر رضي الله عنه حتى اخذ بمكبه و دفعه عن النبي (ﷺ) وقال: ((أتقتلون رجلاً أن يقول ربي الله))[44]؟(غافر/٤٠)

واتە: عەروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ((لە کوڕی عاصمم پرسی و گوتم: ئەو شتەی کە زۆر گران و ناخۆش بوو کە ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا دائەنا دەرهەق بە پێغەمبەر (ﷺ) کردیان چی بوو پێم رابگەیەنە؟ ووتی: لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) رۆژێکیان لە کەعبەدا نوێژی دەکرد، لەوکاتەدا عەقەبەی کوڕی ابی مەعیت هات و بەرگی خۆی کرد ملی و توند رای کوشی وەك بۆ خنکاندنی هەوڵ بدات، ابو بکر (رەزای خوای لێ بێت) پەیا بوو شانی پاڵ داو لە پێغەمبەری دوور خستەوە (ﷺ) و ووتی (ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن کە بڵێت خوا پەروەردگارمە؟)).

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو (ﷺ) کۆڵی نەدا و وازی نەهێنا لە راگەیاندنی پەیامەکەی بە نەوەو دەوروبەری، و چیرۆکی سەرپشك کردنیشی لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیو، دەسەڵات و سامان لەبەرامبەر وازهێنای لەوەی کە بانگێشتەکەی بۆ دەکات، زانراوە، و وەڵامەکەشی (ﷺ) زانراوە.

هاوەلأنیش (رەزای خوایان لیّ بێت)، خـۆ هـەمی جـورا ئـازارو دەردەسـەری تەحـەمول کـرن، هـەر لـەمامەڵـەی سـەخت و جیـاوازی مامڵـەی سـتەمکارانە و چەوساندنەوە، و بە هەموو شێوەکانی توندی و ئەشـکەنجە و گـەمارۆدانی بازرگـانی و خێزانی و کۆمەلأیەتی و رامیاری.

بەلأم دەست بەرداری ئەو رۆڵـە پیرۆزە نـەبوون لـە گـەیاندن و بانگێشـت کردنەکەیاندا، چونکـە ئـەوان لـەمانای سـوننەتی دووچـاری بـوون بـە دەردەسـەری (الابتـلاء) گەیشـتبوون لـە کـاری بـانگخوازیدا و بـەهیچ شـێوەیێك پاشـە کشـێ و خۆدزینەوەیان نەبوو لە ئەنجامدانی کارەکانیانداو بەوپەری بیروباوەریشـەوە دەیـانتوانی کە هەر (ابتلایه)، باوەڕدار دەپالێوریّ بۆ وەدەست هێنانی رەزامەندی خوای گـەورەو، پێوەری باوەڕو تەرازووەکەیەتی و، واتێنەگەین کە فیتنەو تاقی کردنەوە شتێکی خـراپ و شەرانی بێت کە پێویسـت بـەوە خۆمـانی لیّ دوور بگریـن یـان لـە کـەش و هـەواو هۆیەکانی، بەڵکو ئەمە پێویستە، بۆ شۆشتنەوەی باوەڕدارو، پاکردنەوەی دەروونی، لـە گشت شێوەکانی لاوازی و دوو دڵی و ریابازی و دووپێوەری (الازدواجیه)، ئەمە وەك تاقی کردنەوەی زێر وایە لەناو ئاگردا، بۆ پاکردنەوەی لە توخمی مس کە بەهاکەی لـە زێر کەمترە، لەوەشیان دەرك پیّ کردبوو کە خواپەرستی و بەندایەتی کردن بۆ خوا هەر تەنها لـە کاتەکانی خۆشی و هەرزانیدا نابێت، بەڵکو لە بارودۆخی سـەخت و گـران و قەدەغە لیّکردندا دەردەکەویّ رووبەروو لـەگەڵ شێوازەکانی رێگەگرتن لـە بەرنامـەی خوا لێرەدا باوەڕدار وەك شاخ دەچەقێت و رەشەبا کـاری تـیّ ناکـات هـەر تەنـها بـۆ ئەوەی نەخرێتە ناو ئەو لیستەی کە خوای میهرەبان ناوی هێناون و باسـیان دەکـات و دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَـرْفٍ فَـإِنْ أَصَابَـهُ خَـيْرٌ اطْمَـأَنَّ بِـهِ وَإِنْ أَصَابَتْـهُ فِتْنَـةٌ انقَلَـبَ عَلَـى وَجْهِـهِ خَسِـرَ الدُّنْيَـا وَالآخِـرَةَ ذَلِـكَ هُـوَ الْخُسْـرَانُ الْمُبِينُ﴾(الحج/١١)

وه نموونەی ئەشکەنجەدانی بلال و عمار و یاسر وسمیه وخباب، لـه کتێبـه‌کانی سیرەدا باسکراون، و هەروەها نموونەی زۆریتر لە دووچار بوونەوەی بـاوەڕداران لـه درێژایی مێژوو بە جۆرەکانی ئازارو ئەشکەنجە وەك ئەو حاڵەتەی بەسەر ابوبکر داهـات ڕەزای خوای لێ بێت یان بە هەڕەشە کرد بە بەکار هێنانی هێز یان بەکار هێنانی ...

## ڕاگەیاندنی ئیسلامی
## لە گەیاندنی پەیامە ڕوونەکەی ناکەوێت.

گەیاندنی پەیامی ئیسلامی لە ڕووی ( ڕاگەیاندن)ە وە لە کار ناوەستێت، یان سنووردار بکرێت و دابمەزرێت بەپێی بیرو بۆ چوونە بەناو بانگ و باوەکانو ئەوانـەی لە ئارادانو فیکرە دەسەلاتدارەکان.

وەفکرە دەسەلاتدارەکان، چونکە گەیاندن و ڕوون کردنەوەی هەق و بەڵگـە هێنانەوە لە سەریان خەلکی نارەوا دەهەژێنی. ئەویش بـەهۆی ئاشـکرا بوونـی قـەڵبیو کاری لە خشتە بـردن و دیـاری کردنیـان بـە بـیرو هۆشـی خـەڵکی، ئـازاردانی ئـەو کەسانەی کە ئاگاداریان دەکەنەوە لەو لە ڕێگا لادانـەیاندا، چـۆن وا ناکـەن؟ بـەڵکو شتێکی ڕەچاوکراوو دیارە. چونکە ئەوانە لەوە دەترسن کە دەسەلاتو کورسیو ژیانە پڕ لە چێژەکەیان لە دەست بچێت کـە لەسـەر حیسـابی ڕەشو ڕووتو گەلـە ستەم لێکراوەکە بە دەستیان هێناوە. بۆیە هەردەبێ ئـارام بگریـن لەسـەر گشـت شـێوەکانی ئازارو پلانەکانیان. ابراهیم پێغەمبەر (علیـه السـلام) ڕوو بـەڕووی نەوەکـەی هاتـەوە بەبەڵگەی هەق و دیار، کەچی ئەوان بەرپەرچیان دایەوە بەشتی نازانستی و نالۆژیکی و نەگفتو گۆکردن، بەڵکو بەرەنگاریەکی دوژمن کاریانەی پڕ لە پلان و ئازار پێ بەخشین بووە، بەلام خـوای بالادەسـت پێغەمبەرەکـەی پاراسـت لـە هـەموو ئـەو پلانانـە کـە دارێژرابوون هەروەکو خوای گەورە دەفەرمویت وباس لە چۆنیەتی بەرپەرچدانـەوەیان

بۆ ئەو پێغەمبەرە دەكات‌و ئەویش (علیه السلام) چۆن و بە چ شێوەیەك رێنمایان دەكات !! ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ * وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ * قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَانًا فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ * فَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الأَسْفَلِينَ﴾(الصافات/٩٥-٩٨)

هەروەها موسی پێغەمبەر (علیه السلام) لە لایەن نەتەوەكەیەوە ئازاردراوە، لە كاتی راگەیاندنی پەیامەكەی، نەك لەبەر ئەوەی كە لە مانا و چەمكی پەیامەكەی نەگەیشتبوون، بەڵكو لەبەر ئەوەی دڵەكانیان لەسەر رێگای ئیمان لایان دابوو و خەڵەلی كەوتبووە ناو، لەگەڵ كەم و كورتیەكی وا كە وایان لێ بكات بە ئەنقەست بەرەو وەلامدانەوەی نەیەن و لە پێداویستیەكانی ئیمان دەربچن.

هەروەها عیسی (علیه السلام) ئازارێكی زۆری درا لە لایەن نووسەرو فریسیەكان بەهۆی كوفریانەوە و، خۆسەپاندن وەك هەڵگری فیقهی كلاسیكی و كلتووری جادو كەرایەتی و زانیاری تەلمودی و، نەبوونی ئارەزوو بەرەو نوێ كردنەوە و دڵ رەقیان، بۆیە ئەوان ، ئەویان تاوانبار كردن بە ساحرو فالچی و جادو كەر ! و توانیان فەرمانرەوای سەردەمیان فریوبدەن (بیلاتس) ، بەلام ئەو دوو پێغەمبەرە نەوەستان لەسەر بانگێشت كردنی قەومەكەیان بە بەلگەی ئوسولی ئیمانی‌و ئەحكامە شەرعیەكان و لە گشت بوارەكانی ژیاندا، بەبێ ئەوەی هەست بەداخ و كەسەرو ماندوو بوون بكەن .

بەلام هەمیشە خۆراگری‌و بەردەوام بوون لەسەر بانگخوازی سیماو رووخساری پێغەمبەران بووە ( علیهم الصلاه والسلام ) بەگشتی‌و، تەنها دروشمیشیان ﴿وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾(ابراهیم/١٢) بووە، هەروەها چەندان ئایەت دابەزیون كەفەرمان بە پێغەمبەر دەكات (ﷺ) كە ئارام بگرێت لە سەر ئەوەی كە دێتە پێش كاری بانگخوازی‌و راگەیاندنی پەیامی خواو، نەترسان لە خەڵك و ئۆقرە گرتن لە سەر ئێشە دەروونیەكان و ئازارە جەستەییەكان، و هەرەشە لێ كردن، و پاڵە پەستۆی كۆمەلایەتی،

کار یگـەری رامیـاری‌و سەرپشـك کـردن لـە بـواری سامان و دەسـەلات لـە پێنـاو
ڕاندوەستان و کۆڵنەدانی بۆ بەجێ گەیاندنی پەیام و هەولەکانی بەخـەڵك گـەیاندنی‌و،
ئادابرانی لە ژێر ناوی هەر بیانویەك بێت ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُـونَ رِسَـالاتِ اللَّـهِ وَيَخْشَـوْنَهُ وَلا يَخْشَوْنَ أحَدًا إلا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾ (الاحزاب/٣٩)
﴿يَاأَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أنزِلَ إلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنْ النَّاسِ﴾ (المائده/٦٧)

بەڵێ: سور بوونی پێغەمبەر (ﷺ)، لەسەر راگـەیاندنی پەیامەکـەو ئۆقـرەو ئـارامگرتنی لەسـەر هـەموو جۆرەکـانی تۆقـاندن‌و ئـازاردان، کورسـی‌و تـەلاری خـوا نـەناس‌و ستەمکارانی هێنایە لەرزین‌و دوایش بە گۆڕکردنیان. خـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) لەسـەرەتادا، چەکی دژ بە کافران بـەکار نـەهێنا، بـەڵکو تاکـە چـەك‌و قـەڵغانی لـەو، ئـەو ئیمانـە دامەزراوەو، ئارامگرتن لەسەر ئازارو، خورەوشتە بەرزەکەی بـوو، کـە بوونـە مایـەی بڵاوبوونەوەی رووناکی ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

## گفتوگۆ بەباشترین شێوە

گفتوگۆ لـە ئیسلامدا بۆ بەزاندنی بەرامبـەر، و بـێ دەنـگ کردنـی، و ئـارەق پێ‌کردنی و ئـازاردانی نیـە بـەدرکاندن وئاشـکراکردنی کـەم و کورپـەکانی یـان بـە بەرزکردنەوەی دەنگ و هاوارکردن بەسەریدا، وسەر لێ شێواندنی، یـان ئاخـاندنی بـۆ گۆشەیەکی وەستاو.

هەروەها گفتوگۆی لەبارو مەقبول لە قورئاندا ئەوە نیە نەفی زانیاری هـەبوی لایەنی بەرامبەر بکەیت وەك مەرجێکی بنەڕەتی بۆ گەیشتن بە زانیاری‌یەکی تازە بە پێ‌ی یاسای گفتوگۆی (دیالکتیکی)، کە وا دادەنێ، ژێرخانی زانیاری بەیەکەوە بەسـتراوە و

دەبێت لابرێت بەپێی یاسای بەگژیەکداچوون و هەڵوەشاندنەوە (الصراع والنقض) و دوایش سەرلەنوێ بەیەك بەستنەوەی لە دۆخێکی نوێدا کە نەفی ئەوەی پێشوو بکات.

لەراستیدا گفتوگۆ لە ئیسلامدا بریتی‌یە لە، بانگخوازی بۆ بەرنامەی خوا ((ئەو تاك و تەنیایەی کە هەرگیز بوون بە دوو بە خۆیەوە ناگرێت یان هاوبەش وهاوتا بۆ دانانو بەگژداچوونی ونەفی کردنی، و نەك بۆ مەزهەبی بەشەری پێك هاتوو لە بیروڕای خەیاڵی تیۆری و ئارەزوو، و چەندەها هەڵەی وا کە هەر شیاوی بەدیوارادادان بن، بە بیرو بۆچون ونەفی‌یەکانیانەوە. ئەمەش ناکرێت مەگەر بەکاربەجێ‌یەتی (الحکمة) نەبێت، مەبەستیشمان دانانی شتەکانە لە شوێنی خۆی و وشەش لە جێگای جوگرافی شیاوی خۆی، دەستەواژەش لە پێکهاتە واقیعی‌یە رێك و پێکەکەی دا ... هەروەها گفتوگۆ لەپێکهاتەکەیدا دەبێ ئامۆژگاری بە خۆیەوە بگرێت، کە بچێتە ناو دڵەکان و زیندووی بکاتەوە وجێی خۆی دەکاتەوەو رێزلێنانی بەفیترەی دەروونی مرۆڤی پێوە بە دیار دەکەوێت، گفتوگۆش ناکرێت مەگەر تەنها بەو شتانەی کە بەباشترو لە بارترن و هەڵبژاردنی بابەتی و، وشەو بەڵگەو نموونە، لە کاتێکی لەباردا ... وە بە دەنگ و سەدایەکی نەرم و لێوەشاوە و پەنجە بەکارهێنانێکی جوان و دیاری‌کردنی تەوەرەکان، نەك بە چەند تەوەرێکی وا کە کەفائەتەکان لەو ئاستەدا نەبن یان تێگەیشتنێکی کلاسیکی‌ی بۆ بکرێت یان توندڕەوانە بۆ (لایەنە ئیسلامی‌یەکە) بە ئەنقەست، بۆ حسابکردنی کەم و کورتیەکانی لەسەر ئیسلام هەروەك لە چەند بەرنامەیەکی گفتوگۆی تەلەفزیۆنی ئەنجام دەدرێت ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ (النحل / ١٢٥)

# ووتاربێژی جۆرێکە لە جۆرەکانی راگەیاندن

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شێوازی وتاربێژی بەکارهێناوە لــە گــەیاندن وراگــەیاندندا وکاتــێ خــوای گــەورە فـــەرمانی پــێ‌کرد کــە دەســت بــەکاربێت بەئاگادارکردنەوەی کەس و کاری، کە دەفــەرموێت: ((وأنــذر عشــيرتك الأقربــين)) و هەروەها ((فاصدع بما تؤمر واعرض عن المشــركين))، یەکســەر ئــەو فەرمانــەی بــەجێ گەیاند و دەستی‌کرد بە شێوازی وتاربێژتن، کە دادەنرێت بە کاریگەرترین و بــەهێزترین هۆکاری راگەیاندن و پڕوپاگەندە و پەیوەندی‌کردن بەجەماوەرەوە، لــەکاتێکدا ئەگــەر بێتو وتــاربێژی بەشــێوەیەکی هونــەری و زانســتی بــەکارهێنرا ئــەوا ئاکــامێکی بــاش و لەبەرچاوی دەبێت، و گشت رەوت و لایەنە چاك خــوازو فیداکاریــەکان بــە درێژایــی مێژوو بەکاریان هێناوە تەنانەت، (ئەرستۆ) کتێبێکی تایبەتی لەسەر نوسیوە.

هەر لەگەڵ رەسیدەنی ئەو فەرمانە خوایی‌یە پێغەمبەر (صلــی الله علیــه وســلم) سەر سەفا کەوت، دوای ئەوەی خزم و کەس و کاری خۆی کۆکردەوە و وتارێکی بــۆ خوێندنەوە و ووتی: ((یا بني عبدالمطلب یا بني فهد،یا بني کعب: أرأیتم لــو أخــبرتکم أنَّ خيلاً بسفح هذا الوادي ترید أن تُغير عليكم أصدقتموني؟ قالوا نعــم قــال: ((فــاني نذيــر لكم بين يدي عذاب شديد [٤٥].)) واتە: ئەی نەوەی عبدالمطلب ئەی نەوەی فەهد، ئەی نەوەی کەعب، ئەگەر پێتان رابگەیەنم کە هێزێك لە کەنار ئــەو شــیوەوەیە و دەیــەوێ پەلامارتان بدات، ئایا پێم باوەڕ دەکەن؟ ووتیان بەڵێ، ئینجا (صلی الله علیه وسلم) پێ‌ی گوتن: ((ئەوا منیش ئاگادارتان دەکەمەوە لە ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر بەتین)).

لێرەدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شوێنێکی لەبارو گونجاوی هەڵبژارد بۆ پێش کەش کردنی و تارەکەی کە شوێنێکی بەرز بــوو، و هــەروەها کــاتێکی شــیاو بــۆ ئامادەبوونی ئامادەبوان ... خاڵێکی تر کە گشت جوانکاریەکانی خزمایەتی بە بانگێشــی تایبەتی ناوهێنا بۆ سەرنج راکێشانیان و گرنگی‌دانیان بەقسەکانی ... دوایش ویستی کــە

وتارەکەی لەسەر زەمینەیەکی پڕ لە متمانەوە دابمەزرێنێ، چونکە هەر وتارێك ئەگەر گوێگر دڵنیا نەبێت لە راستگۆیی ووتاربێژو دڵسۆزیی، ئەوا کاریگەریەکی ئەو تۆی نابێت وکەس گوێی بۆ شل ناکات، بەڵکو لێشی رادەکەن و بەلەخشتەبەر و پڕۆپاگەندەباز تاوانباری دەکەن، و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) شیاوی ئەو متمانەیە بوو بەو راستگۆیی و دەست پاکیەی کە پێیانەوە ناسرابوو و دیاربوو.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ((فَإِنَّهُمْ لا يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ)) (الأنعام / ٣٣) هەر تەنها بۆ تاقیکردنەوەیەکی گرنگی پرسیاری لێ کردن بۆ زانینی ئاستی بڕوا پێ کردنیان بەووتارەکەی، بە ئەگەری بوونی هێزێك لە کەنار شیوەکە و وەڵامەکەشیان بەڵێ بوو، لێرەدا کاتێ دڵنیا بوو لەوەی کە ئامادەبووان گوێی بۆ دەگرن، ئینجا دەستی کرد بە پێشکەش کردنی پەیامەکەی و ووتار خوێندنەوەکەی وئاگادارکردنەوە وترساندنیان لە ئەشکەنجەیەکی زۆر ونزیك ئەگەر بێتو وەڵامی ئەو ئاگادارکردنەوەیە نەدەنەوە وەیان ئەگەر وەڵام دانەوەکە سەلبی بوو، هەلبەتە وەڵامدانەوەکە ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوانەی کە وتاریان بۆ دەبێژدرێت، کە بەدڵی ئامادەبوان نەبووە بەتایبەتیش (ئەبو لەهەب) کە بێ ئەدەبی کرد وهەر تەنها نەوەستا بە وەڵام نەدانەوە وقەبووڵ نەکردنی پەیامەکە! بەڵکو چەند قسەیەکی ناشیرینی بەو نازدارە گووت کە زانراوە.

لەشاری مەدینەشدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەمان کاری وتاربێژی درێژەپێدا و چەند وتارێکی کرد بە (سوننەت) وەك وتاری رۆژی هەینی، هەردوو جەژنەکە، رۆژی عەرەفە ... هەروەها بەپێی پێویست وتاری تریشی دەدا بۆ موسولمانان وەك وتاری پێ راگەیاندنی شەریعەتێ و زانستی، لەوکاتانەدا بانگ بێژی، دەناردە شار بۆ ئەوەی خەڵکی ئاگاداربکاتەوە لەو ووتارەیە بە دەستەواژەی (الصلاة جامعة) و خەڵکی کۆدەبوونەوە و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) سەر مینبەرەکەی دەکەوت بۆ راگەیاندنی ئەو بابەتەی کە دەیویست، و خواو رۆژی دوایی وفەرمان بە چاکە ونەرێ

لــە خراپــەی بــەبیر دەهێنانــەوە، یــان بــۆ چارەســەرکردنی گرفتێــك. وە لــە ووتـــارە بەناوبانگەکەی (ئەنصار)ەکان کە سەرکەوتنێکی بێ وێنەی وە دەست هێنا و فرمێسـکی لەچاوی هاوکارەکان (الأنصار) هێنایە خـوارەوەو هەسـتی جۆشـاندن وئیمانیـانی زیـاد کردن، پاش ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەستی بەوە کرد کە هاوکارەکـان شتێکیان لا دروست بووە لە ئەنجامی دابەش کردنی دەستکەوتەکانی جەنگی حونەین و تایبەتمەندکردنی ئەوانەی کە تازە، هاتبوونە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەك یارمەتیەك بـۆ دامەزراندن وچەسپاندنیان لەسەر ئایین، وتارەکەش لــە شـێوەی گفتوگـۆ بـوو کـە بـە دوعایەکی گەرم کۆتایی پێ هێنا و فەرمووی: ((اللهم اغفـر الأنصـار، وابنـاء الأنصـار، وأبناء أبناء الأنصار)) (٤٦) هەروەها لەوانەش وتاری ئـازادکردنی شـاری مەککـە (یوم الفتح) و وتاری حەجیماڵئاوایی کە گشت لایەنە بوو لەقەدەغەکردنی هەندێ شـت. بەوپەڕی کاریگەریەوە.

ئیسلام وەك ئایین ئەو راگەیاندنەی جاهیلیەتی گـۆڕی کـە گرنگـی دەدا بـە لایەنی دارشتنی شیعری‌و پیشەیەك بوو بۆ شانازی کردن، وەکەمکردنـەوەی کەسایەتی کەسانی تر وبەرامبەرەکەی، وهاندەری بوژاندنەوەی بەگژداچوون وتێکـدان بـوو، بـە رەوانبێژی دەناسرا، هەستەکانی دەبزواند، ئارەزووەکانی دەخرۆشاند.

راگەیاندنی ئیمانی، هەر تەنها هـەق دەڵـێ، لێپرسـراویەتی دەخاتـە بـەرچاو، فەرمان بە چاکەو دادپەروەری سەقامگیر دەکات‌و رێنمایی دەکات بەرەو راسـتە رێی ئیسلام، وتارەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ناوە پیرۆزەکانی خوای بـۆ خـەڵك روون دەکردەوە بە گوێرەی قورئان، رەوشتی نوێی قورئانی دەسازاند وبنیاتی دەنـا، و باوەڕدارە شایستەکان ڕێز لێ دەنێت. هەروەها جێ نشینەکانیشـی بەهـەمان شـێوە، لــە رۆژانی هەینی و جەژنەکان‌و بۆنەی تر، وتاریان بۆ خەڵکی دەخوێندەوە.

سەرکردەکانی موسوڵمانانیش، وتاری جـۆراو جـۆری پـڕ لــە حەماسـیان بـۆ موجـاهیدان دەخوێنـدەوە و هـانی جـەنگاوەرانیان دەدا بـۆ خۆبـەخت کـردن لــەپێناو

بلاوکردنەوەی پەیامی پیرۆزی ئیسلام، هەر ئەو وتارانەش بوون کە ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو وەك ئاکتیڤێك بۆ سەرکەوتن وئازاد کردنی زۆربەی وڵاتان ... و وتارەکەی سەرکردەی موسولمانان (طارق بن زیاد) لە کاتی چوونی بۆ ڕزگارکردنی ئەندەلس زانراوە، بە کاریگەریە کەم وێنەکەی، ودەستەواژە ئیمانیەکەی ورەوشتە بەرز ودیارەکەی.

## وتاری هەینی سەکۆیەکی ڕاگەیاندنە ... بەڵام!!!

وتاربێژیە کەچی هۆکارو فاکەرێکی ئیمانی ورەوشت وجیهادی لاوەکیە، بەلام هەردەبێ هەوڵی دروست کردن وپێ گەیاندنی بروادارنی بدرێت، ڕێك لەگەڵ بەرنامە میکانیکی یەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پەیوەندی کردنێکی ڕاستەوخۆ وچوونە ناو جەرگەی ژیانی کۆمەڵگا، چونکە وتاربێژی ڕۆڵێکی بەرچاو و خاوەن بڕیارە لە وەبیرهێنانەوەی بڕوادارانی بە گرنگترین ئەو دۆسیانەی کە پێیەوەی خەریکن، و پاڵپشتی کردن لە هەستی ئیمانی لە وتەکانیاندا و هێنانەوەی نموونەی ئارام و پارێزکاری لەسەر ڕووداوەکانی ڕۆژگار، ... ڕاگەیاندنی هەق بە فەرمانڕەوایان و ئاگادارکردنەوەیان لە فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە، لەو بوارانەی کاری تیا دەکەن.

بەڕاستی وتاربێژی فاکەرێکی باشی ڕاگەیاندنە، دەبێ ڕۆڵی بەرچاوی خۆی ببینێ، بە تایبەتی دوای زیادبوونی مەترسی ئەو ڕۆڵەی کە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن پێ ی هەڵدەستن لە ژیانی ئێستاماندا و یاری کردن بە ژیری وهەست وکاروبارەکان بە ویستی، لایەنە نائیسلامیەکان، کە لە زۆربەی کاتەکاندا ڕووخێنەری ئیمان وپارێزکارین ... بەڵام ئایا ئەو فاکەرە ڕاگەیاندنە (وتاربێژی) ڕۆڵی ڕاگەیاندنی خۆی دەبینێت وەك پێویست لە وڵاتانی ئێمەدا؟! وەڵام، نەخێر وبەداخەوە، چونکە وتاربێژی هەر تەنها

دەنگ بەرزکردنەوەو سوورهەڵگەڕان ودەورَ نواندنی لەگەڵ خرۆشان نیە، یان لاسایی کردنەوەی چەند وتاربێژێکی بەناوبانگ نیــە، لەشـێوەو چۆنیـەتی وتـار خوێندنـەوە ...

هەروەها چەند وتارێك هەن کە پێویستە لەسەر مینبەرەکان وەلاوەبنرێن و ون بکرێــن، چونکە ئەرکی راگەیاندنی پەیامەکەیان لێ رەچاو ناکرێت وبەجێ ی ناگەیەنن. لەو جۆرە شێوازانەش، وتاری پڕ لە حــەماس و زیادلـەڕادەو هێنانـە جـۆش وخرۆشـی گوێ گـر، لەسەرەتاوە تا کۆتایی، باڵ بەسەر وتارەکــەدا دەکێشـی بەســەروتارەکە، بەشـێوەیەکی ئینفعالی، بەلاّم ناگاتە ئاستی ئەوەی کـە کاربکاتـە سـەر گوێ گـر وفیـرەو هـۆش ودڵ وجێگیرکردن وبەرەسەن کردنی قەناعەتێکی نەگۆڕ لە دڵی ئامادەبواندا، وناشبێتە هۆی زیادکردن وبەرزکردنەوەی ئیمانێکی قورئانی وپێغەمبەری، کە دارێــژراو بێـت لەسـەر تێڕوانین وتێ گەیشتن لە ئایەتەکانی خوا، لە دەروون ودەورووپشت وئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، کەوا لە باوەڕداربکەن لە کەش وهەوایەکی پڕ لە چەمکی مل کەچی ودڵنیایی، ودڵ ئارامی ودڵسۆزی وتەسبیح ویادکردنەوەیەکی دڵیــدا بژێـت، یـان گەشـتێکی پــێ بکات بەرەو رۆژی دوایی بە بەهەشت ودۆزەخ ودیمەنەکانیانەوەو دەروون پاك بکاتەوە لە نەخۆشیەکانی خراپەکاری ولەخۆبایی بوون، ریابازی ودووڕوویی وشانازی کردن بە زۆربوونی ئەوەی.

شێوەیەکی تری وتار، ئەو شێوە زانستیەیە زیادرەوەیە لە هێمنی وشیتەڵ کردن وخوێندنەوەی وتارەکە وەك بلــێ ی دوان یـان وانەیـەك بلێتـەوە بـۆ ئاسـتێکی بـەرزی گوێگران لــە رووی، فیکـری ودەروونـی، ئـەو کاتـەش زۆربـەی ئامـادەبوان هەسـت بەبێزاری دەکەن وئارەزووی ئەوەیان نامێنێ کە چیتر گوێ ی بۆ شل بکەن، بەتایبــەتیش ئەگەر وتارەکە درێژەبکێشێ وبچێتە ناو بابەتێك کە دووربێــت لــە ئاسـتی تێگەیشـتنی ئامادەبوان، ئیتر ناوە ناوە چاویان دەکەوێتە سەریەك وخەوە توتکە دەیان گـرێ وئاواتـە خوازن کە زوو وتارەکە کۆتایی پێ بێت !!!

بیسەرانی دەکات وئەوانیش تەنها هەر ئەوەندەیان لەسەرە کە گوێی بۆ شل کەن (بیانەوێ یان نەیانەوێ)، بەم جۆرە دەچێتە جیهانی گیروگرفتەکانی نووسەری کتێبەکە و، لە چوارچێوەی رۆژگار ومەسەلەکانی جیهانی خۆی دەردەچێت بۆ ئەوەی لەگەڵ وتاربێژ چەند کاتێك بەسەر بەرێت دوور لە دۆسیەکانی سەردەم ودەوروبەری خۆی؟!!!

وتاربێژی واش هەن، کە وتاری جێگیر و لەحیم کراو ئامادەدەکات بۆ گشت بۆنە ویادگاریەکان ودووبارەیان دەکاتەوە بە گوێرەی رۆژژمێر (تقویم)، کە ناوەرۆکەکانیشیان دیاری کراون وگۆڕانکاریان تیا ناکرێت، بۆیە ئەوانەی کە بە بەردەوامی وتارە ئیمانی وزانستیەکانیان، لەو جۆرە وتار بێژانە گوێ لێ دەبێت، دەبینین ئاستی ژیری وگرنگی دان وزانیاری ئەوانیش دیاریکراوە وبەستراوە بە بازنەی زانستی وزانیاری دیاری کراوی ئەو وتاربێژە، کە لەماڵەکەیان نزیکە، هەرچەندە هەست بەبێزاری ونارەحەتی بکات وتێڕوانینێکی جوزئی لا دروست بوو بێت بەرامبەر بەو ئیسلامە فراوانە، لەوانەیە هەندێك لە موسوڵمانان رێی مزگەوتێکی دوورتر بگرنە بەر هەر لەبەر ئەو هۆیەیە، هەرچەندە لەوانەیە ماندووبوون ودرەنگی وپارەیەکی زۆریشی بکەوێتە سەر ؟!!!

هەر بۆ زیاتر ئاشنا بونمان بە وتار وتاربێژان، جۆرێکی تری وتاربێژ دەخەینە بەر چاوان، ئەویش، ئەو وتاربێژەیە کەبەر لە پێگەیشتنی بەروبووەکەی هەوڵی رنینی بدات، هەرزوو لەوتارەکانیدا، ستەم وستەمکاریە کۆمەڵایەتی ورامیاری وئابوریەکان، رابوونێکی لا دروست دەکەن وهانی دەدەن کە ئینکاریان لێ بکات، بەشێوەیەك کە هیچ لە خراپەکاریەکان نەگۆڕێت وببێتە هۆی دوورکردنەوەی وقەدەغەکردنی لە وتارو بێ بەشکردنی گوێگرانی لەو زانستەی کە هەیەتی، لەکاتێکدا، وشەی شیرین و پیرۆز وەك تۆو وایە، پێویستی بەکات و سەرپەرشتیەکی زۆر هەیە تا پێ دەگات، و پەلە کردن لە رنین وبەدەست هێنانی، ئاکامێکی پێچەوانەی مەبەستی لێ دێتە دی، وەزۆر

شێوەیەكی تری وتار، ئەوەیە كە لە ئاستێكدایە، كە وتاربێژ گرنگییەكی وای پێ نادات كە بۆ وتار بشێت، مەگەر هەر تەنها بـۆ منـاڵان نـەبێت، یـان لـە ئاسـتێكی فیكری سەرەتاییدا، دەبینین وتاربێژ بە درێـژی وتـێرو تەسـەلی بـاس لـە پـاك وخـاوێنی وجۆنیەتی جۆرنە گەرماو وخۆشوشتن دەكات، لە كاتێكا دڵـەكان ژەنگیـان هـەڵێناوە، ورەوشت بەجارێ رووخاوەو بابەتی پاك كردنـەوەی دەروون بۆتـە شـتێك هـەر باسـی لێوەناكرێت!؟، خێزان هەرەشەی لێك ترازان وپیـس بوونـی لێ دەكرێـت، وبیانیـەكان ژینگەمان لێ پیس دەكەن، ئایا پاك وخاوێنی دڵ ودەروون وپاراستنی خێزان و وڵات لە بابەتەكانی سەرەكی ولەپێشەوەتر نین كە باسیان لێوەبكرێت؟ وپـاك وخـاوێنی جەسـتە بكرێت بە پاشكۆ تەوەری ئەو باسـانە؟ یـان وتـاربێژێك دێتـە سـەر مینبـەر وبـاس لـە ئەحكامەكانی قوربـانی دەكـات بـەووردی، هـەر لـە چۆنیـەتی قوربانیەكـە، وتەمـەنی ومەرجـەكانی كـە كـاتێكی بـاش دەخایـەنێت وبـاس لـە دەردەسـەری و بەسـەرهاتی باوەڕداران وئـەو ستەمەی كـە لێیـان دەكرێـت وئـەو قوربانیانـەی كـە شـەقامەكانی دوژمنانیـان پڕكـردووە ناكـات، یـان ئـەو ئافرەتـە موسـوڵمانانەی كـە بونەتـە قوربـانی توندوتیژی وپەلاماردانیان، چی؟ و ئەو منالانـەی كـە دەكوژرێـن و لـە ئـایین هـەڵیان دەگەڕێننەوەو لە ناسنامەی ئاینیەكەیان دەیان سڕنەوە لە وڵاتانی كوفر، چی؟ مەگەر لە كۆتایی وتارەكە لە دوعاكانیاندا باسیان لێوەبكەن !!!

وە لەو جۆرە وتارانەی كـە بێزاركـەرو كـەم كاریگـەرن ئـەو وتارانـەن كـە دەنووسرێنەوەو فۆتۆكۆپی دەكرێن ودەكرێن بە كتێب، ئەوەش كاتێ یەكێك لەو رۆڵـە گرنگەی وتاربێژی دەگرێتە ئەستۆو دەچێتە سەر ئەو سەكۆ (مینبر)ەیەی كـە رۆژێ لـە رۆژان مینبەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە، وخۆی بۆ ئامادەنەكردوە وشیاوی ئەو جێیە نیە، پەنا دەباتە بەر كتێبێك كە لەسەردەمێكی تر دانرابێت، یان لە وڵاتێكـی تـر وبـەپێی ئـارەزوو وبۆچوونـی نووسـەر، بـۆ ئـەوەی بیكـات بەرابـەری بـۆ كـارە وتاربێژیەكەی، جا وتارێك لـە وتارەكـان هـەڵدەبژێرێت وبەلاواندنـەوە پێـش كەشـی

جارانیش وا دەبێتر ڕوودەدات کە جەماوەری هاندەرو فشار شارەزایی ودووربینیەکی پێویستیان نیە لە بانگخوازی کە پێی هەڵسن، ڕۆڵێکی کاریگەریان دەبێت لە هاندانی وتاربێژ بۆ هەڵوێست وەرگرتنێکی گەرم وراستەوخۆ دژ بە دەسەڵات، بێ ڕەچاوکردنی هەنگاوەکانی بانگخوازی و وردەکاریەکان وقەبارەی بەرەنگاربوون وهێزە کاریگەریەکان. وەزۆر جارانیش جەماوەر مل کەچی پیلانی بە گژیەکداچوونی حیزبی، نێوان ئەو کۆمەڵ ورەوتانە دەبن کە پێشبڕکێیانە لەسەر دەسەڵات، کە بەهیچ شێوەیەك ڕازی نین بە ئیسلام وەك ئایین ودەولەت، بەڵکو هەوڵی بەکارهێنانی ئیسلام دەدەن بۆ بەرگری کردن لە سوودەکانی خۆیانو زیاتر مانەوەیان لەسەر تەختی حوکمڕانی.

دوایش ئەو جەماوەر و کۆمەڵە هاندەرە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ وتاربێژەکەیان ناوەستن، کە حەق (تاڵ)ی گوتووە ودووچاری تەنگ پی هەڵچنین ودەردەسەری دێت، بەڵکو ڕازی لێ‌دێنن کە هەر خۆی بە تەنها بارهەڵگری قسەکانی بێت!!! ولەوانیش (سالم مسلح) بۆی دەردەچن ولەوانەشە لۆمەی وتاربێژەکەش بکەن، بەوەی کە زوو هەڵچووە ورەچاوی بارەکەی نەکردووە وباس لە شتێك دەکات کە لە قەبارەی خۆی گەورەترەو کاری ئەو نەبووە، و لەو جۆرە گلەییانە!!!

زۆربەی نوێژکەران لەڕووی ئیمانیەوە، بەرێکی ئامادەنەکراون بۆ ئارام گرتن لەسەر ئیبتلاو تاقیکردنەوە، ودەیەوێت کە وتاربێژ، نوێنەرایەتی بکات لە کاری بەرەنگاربوونەو وهەڵڕێشتنی غەم وپەژارە ومەبەستەکانی، وئەویش بەوپەڕی دڵخۆشیەوە بارگە (شحنە)کانی بەتاڵ بکات بە هەستێکی خۆمەلاسدان، وە ئەگەر وتاربێژ باسی لەو شتانە کرد کە ئەو جەماوەرە توانای درکاندنی نەبوو، ئەوا لە بازاڕ ومالەکان دەیکەن بە مقۆ مقۆو وێردی سەر زاریان (ئەمڕۆ مامۆستا فلان، بەسەر بادانێکەوە، حەشری کرد، دونیای هێنایە هەژان)، هەروەك چۆوبێتە دیار فلیمێکی سینەمایی وباس لە ئازایەتی وچاونەترسی پاڵەوانی فلیمەکە بکات ...!!! بەڵام بیر لەوە

ناکاتەوە کە برِگەکانی ئەو وتارە.تا چەند وچ رادەیەك ئەو جەماوەرە دەگریتەوە ورۆلی چیە لە جیبەجی کردنی ناوەرۆکی وتارەکە.

لە راستیدا زۆر جۆری وتار و وتاربیژان هەن، ناکری بە دوورو دریژی باس لەهەر هەموانیان بکەین، بەلام جۆریکی تری وتاربیژان، ئاماژەی بۆ دەکەین، ئەویش ئەو وتاربیژانەن کە لە رووی ئیمان وزانستی ودەروون پاکی باش خۆیان ئامادەنەکردووە وچوونەتە ناو بازنەی وتاربیژی وەك پیشە، یان بەهۆی ویراسی خیزانی، کە دەبی بنەمالەی مەلایەك، کورەکەشی مەلا بیت وجیی باوکی بگریتەوە هەرچەندە شیاویش نەبیت، یان بۆ بەدەست هینانی پلەوپایەکی کۆمەلایەتی بۆیە خەلکی لە بیستنی وتارەکەی جیاوازیەکی زۆر تیبینی دەکەن لەگەل کردەوەکانی وکاتیکی زۆر دەکوژیت بە چەند بابەتیکی مردوو ودوور لە واقیع، یان ئەمەیان کە لە هەموویان ترسناکترە ... خۆی لەگەل گشت باروذۆخیك دەگونجینی، ئەگەر بارودۆخەکە نالەباریش بیت، ولایەنگری ستەمکاران دەکات وبی دەنگی دەنوینی لەسەر دوژمنکاری وگوناهەکانیان، وکارکردنیش لەگەل عەلمانیەکان، بەشتیکی ئاسایی دەزانیت ولەوانەیە بچیتە ناو ریزەکانیان وشانازیشی پیوە بکات! یان پراکتیك کردنی بازرگانی سیاسی بە ئایین و، هەلدەستی بەوتارخویندنەوە بۆ فەرمانرِەواو دەسەلاتداران لەو بابەتانەی کە کار لە کارە ناشەرعیەکانیان نەکات، و ستایشیان دەکات لە کۆرِو کۆبوونەوەکاندا لە بەرامبەر چەند ئیمتیازاتیکی ماددی ومەعنەوی بی ئەرزشدا ، ئەو جۆرە وتاربیژانە پەردە دووکەلیکی چرِ دروست دەکەن لە نیوان خەلك و ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا، وگوناهو تاوانیکی زۆر هەلدەگرن لەو ریابازیو بی دەنگیە و بەرِی کەوتنیان لە گەلیاندا هەر تەنها لە برِی دەستکەوتیکی دونیایی کەم.

وا باشترە بۆ ئەوانە کە بە خۆیاندا بچنەوە، چونکە لیپسراویەتی زۆر ترسناکە بەرامبەر خوا لەم ئایینەدا، کە ئەو بی گەردیەی دەشیویندریت لەبەر چاوی خەلکانی تردا.

# هونەری نامەی ڕاگەیاندن و وتوێژی بانگخوازی

یەکێ لە هۆکارە بەکارهێنراوەکانی ڕاگەیاندن، نامە ونووسراو ناردنە، بۆ ئەو کەسەی کە مەبەستە ئاگاداربکرێتەوە و پەیامی پێ ڕابگەیدنرێت، خوای گەورە باسی سلیمان پێغەمبەرمان (علیه السلام) بۆ دەگێڕێتەوە دەربارەی ئەوەی کە نامەیەکی نووسیوەو داویەتی بە (هد هد) بۆ ئەوەی بیگەیێنێتە شاژنی یەمەن هەروەکو دەفەرموێت : ﴿اذْهَب بِّكِتَابِي هَذَا فَأَلْقِهِ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ * قَالَتْ يَا أَيُّهَا المَلأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ * إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * أَلاَّ تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾ (النمل / ٢٨-٣١)

و داوای لە هەڵگری نامە کرد کە وەلامەکەیانی لێ وەرگرێتەوە لەگەڵ ووردبوونەوە لە کاریگەری نامەکە لەسەریاندا ((فانظر ماذا يرجعون)) ... نامەکەشی ڕازاندبوەوە بەو پەڕی مانای ڕێز هەر لەسەرەتاو، ناوەڕۆکو، دارشتن وکۆتاییەکەیدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێویستە هۆکاری ڕاگەیاندن گونجاو بێت لەگەڵ ڕۆژگار گرنگی پێبدرێت بۆ ئەوەی کاریگەر بێت لەسەر وەرگر ونامە، نابێ نالەبار بێت لەرووی چۆنیەتی دارشتنیداو خراپو، خاو نەبێت ورەزیلی (بخیل)ی وبێ مەیلی خاوەن نامە نیشان نەدات ... هەروەها نامەکەی سلیمان پێغەمبەر (عیله السلام) بریتی بوو لە نامەیەکی یەك لاکەرەوە وبەکورتی ودوور لە دارشتنی دوور وڕیزکردنی وشەی بێزارکەر کە لە تەوەرە سەرەکی وبنەڕەتیەکە دەردەچن، هەر لە نامەکەدا بەهێزی ومتمانە بەخۆکردن وهەست نەکردن بە هیچ شتێکی وا کە لەپایەی بەرامبەر کەم بکاتەوە یان روخساری شەڕیێ فرۆشتن وسوکایەتی پێوەدیاربێت. لە هەمووش گرنگتر ئەوەیە کە بە ناوی خوا (بسم الله الرحمن الرحيم) دەستی پێکردووە، نەك بەناوی ناوێك یان گەل یان کەسێك کە نازناوی (الجلالة والعظمة)ی خاوەن شکۆ وپایەبەرز، بەکاربهێنرێت کە تایبەتن، بە خوای بالادەستی بێ هاوتا. ئەوەی شایانی باسە ووتن

وەوسێنی (بسم الله) تەنها تایبەت نی‌یە بە موسولمانانی باوەڕهێنەر بە پێغەمبەرایەتی (محمد) صلی الله علیه وسلم، بەڵکو وەك دەستپێکردنێکی پیرۆز، گشت موسولمانان بە درێژایی مێژوو بەکاریان هێناوە لەوانەش، (سلیمان)ی پێغەمبەرو پاشا (علیه السلام). وە گۆڕینی ئەو (بسم الله)یە بە هەر دەستەواژەیەکی تری دەست پێ‌کردن، داهێنانێکی راگەیاندنە، لەگەڵ ئاداب ورەوشتی ئیسلام ناگونجێت.

پێغەمبەری پێشەواش (صلی الله علیه وسلم) نامەی نووسی بۆ پاشا وفەرمانڕەواکانی هاوچەرخی خۆی بۆ تەواو راگەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی‌و، بۆ ئەوەی کەس لێی بێ بەش نەبێت وبێ ئاگا نەبێت لەبەرجەستەکردنێکی میکانیزمی سۆز ومیهرەبانیەتی ئیسلام وەك (رحمة للعالمین) ﴿وَمَا أرْسَلْنَاكَ إلا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ (الأنبياء/١٠٧)

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چەند نامەیەکی نارد بۆ نەجاشی وکیسرا وقەیسەر، ئەو نامانەش لەکاتێکدا هاتن کە لەگەڵ کاتەکە گونجاو لەباربوون کە پێیەکانی جێ‌ی خۆیان کردبووەوە لەسەر زەویدا، و بە هیچ شێوەیەك لەخۆبایی بوون، یان ترس و ریا و ئەو جۆرە رەوشتانەی پێوە دیارنەبوو.

وە لە یەکێك لەو نامانەی کە بۆ قەیسەری ناردبوو هاتوە و دەڵێ: ((بسم الله الرحمن الرحيم، من محمد بن عبدالله إلى هرقل عظيم الروم، سلام على من أتبع الهدى أما بعد، فاني أدعوك بدعاية الإسلام، اسلم تسلم واسلم يؤتك الله أجرك مرتين، فان توليت فعليك اثم الأريسيين: (قُلْ يَاأهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ألا نَعْبُدَ إلا اللّهَ وَلا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أرْبَابًا مِنْ دُونِ اللّهِ فَإنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأنَّا مُسْلِمُونَ) [٤٧].

واتە: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، لە محمدی بەندە ونێردراوی خواوە بۆ هرەقلی گەورەی رۆم، سەلام لەسەر ئەوە بێت کە شوێن هیدایەت دەکەوێت، ئینجا، بانگت دەکەم بۆ ئایینی ئیسلام، موسولمان بە و رزگارت دەبێت وموسلمان بە

خوا دوو پاداشتت دەداتەوە، ئەگەر لەبەردەم ئەم بانگەوازە راتەکرد ئەوا گوناهی ئەوانەش دەکەوێتە ئەستۆی تۆوە کە بە موسولمان نەبوونت ئەوانیش هیدایەت نابن، وە کۆتایشی بە ئایەتەکە هێنا کە لەسەرەوە پاداشت کراوە و ئاماژەی پێ کراوە.

لە شی کردنەوەی نامەکەدا چەند رووخسارێکی پێویستمان بەرچاو دەکەوێت، کە دەبێ لەو جۆرە نامە راگەیاندنانەدا هەبن، سەرەتاکەی بە، بسم الله الرحمن الرحيم، و بەڵ نەکێشانی هیچ ناو ونازناوێکی رازاوە وبەگەورەدانان وزل کردنی تیا نیە لەسەر ناوی نوێنەری نامەکە، تەنها (رسول الله) کە خۆی پێناسەکردوە بە بەندەی خوا، بەر لە هەڵگری پەیامەکەی، وناوهێنانی بۆ نێردراو بەو ناونیشانە واقیعەی کە لەناو گەلەکەی خۆیدا هەیەتی بێ ئەوەی تەزکیەی بکات‌و بەو لێپسراویەتیەی کە هەیەتی هەرچۆنێك بێت ئەو (گەورەی رۆم)ە نەك گەورەیەکی رەها، ئینجا ناوی بۆ نێردراو دوایی هاتووە، و (سەلام)یشی راستەوخۆ ئاراستە نەکردووە بەشێوەیەکی دیاریکراو، بۆ ئەوەی لەناوەڕۆکەکەی والێك نەدرێتەوە کەڕێی راستی گرتووە ولێ قبوڵ بکرێت. بەڵکو بۆ ئەوەی هەست بکات کە پێویستی بە هیدایەت هەیە، بەتایبەتیش کە بەڕاستی بانگێشتەکراوە بۆ ئیسلام، بۆ ئەوەی رزگاربێت لەدونیاو رۆژی دوایدا وپاداشتی خۆی دووقات وەردەگرێت، ئەم بەشەشیان وەك هاندەرو دڵ خۆشکەرێکە کە هەردوو شێوەکە خۆیان بینیوەتەوە لە خاڵی ئاگادارکردنەوەو ترساندن بە لە ئەستۆ گرتنی گوناهی گەلەکەی. (اسلم تسلم واسلم يؤتك الله أجرك مرتين، فان توليت فعليك اثم الأرسين) کە دەبێتە کۆسپ لەبەردەم هیدایەت بوونی گەلەکەی.

کەچی ئایەتە پیرۆزەکەیە، کە لەسەر چەند بنەمایەکی گفتوگۆی ئیمانی دڵسۆزی دادەمەزرێنێت، بەیەکگەیشتن لە خاڵێکی هاوبەشدا لەسەر وشەیەکی هاوبەشدا ئەویش بە تەنها زانینی بەندایەتی کردنە بۆ خوای تاك وتەنیا لە گشت بوارەکانی ژیاندا ویاسا تەنها یاسای خوا بێت، رزگارکردن و پاککردنەوەی باوەڕ لە هەموو شێوەکانی شیرك، کە دیاندکان تیای کەوتوون و داماڵینی لەگشت جۆرەکانی

زیاتروەی وگیورەکردن، و رزگارکردنی مرۆڤ لە بەندایەتی کردن بۆ مرۆڤ و بەخواززانینیان (خوا پەنامان بدات)، جا هەرچییەك بن، پێغەمبەران، لەحبار و رەهبان، سەرکردە وپاشایەکان یان سیاسەتمەدارو رووناك بیران ... و بەبێ بوونی ئەم شتانە موسولمانان بەو رووخسارە ئیمانیە دەپارێزرێن وئیسلام بوونی تەواو و بێ گەردیان بۆ خوای گەورە وادەگەیەنن.

## بیرو بۆچوونی ئیسلام بۆ جنس لە راگەیاندندا

خوای گەورەو کاربەجێ دەفەرموێت: ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُمْ بِهِ مِنْ بَعْدِ الْفَرِيضَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ (النساء/ ٢٤)

خۆ قەڵابەندکردن، لە ماناکەیدا نزیك دەبێتەوە لە خۆپاراستن وپارێزگاری وبەرگری کردن، وقەڵای سەربازیش لەو شوێنەیە کە لەوانەی تیایدان، دەیانپارێزێت لە پەلاماری دوژمنان و هەوڵەکانی بڕینی شوورەکانیان لە دەرەوە. ئافرەتی قەڵابەندکراو (المحصنة)، ئەو ئافرەتەیە یان ئەو ژنەیە کە چووەتە ناو قەڵای پەیوەندی هاوسەریی شەرعی، ئەوانە حەرامن لە کەسانی تر جگە لە مێردەکەی نەبێت، بۆ هیچ کەسێکی تر حەلاڵ نین ونابێ کەس چاویان تێ ببڕێت و بە فووڵی سەیریان بکات (ئەمەش)ە کە بەشێوەیەك ببێتە مایەی ئارەزوو لێکردن. هەڵبەتە شتی تریشی بە دواوە دێت لە ڕێڵی وگومڕایی. خێزانیش یەکەیەکی بنەڕەتی کۆمەڵگایە، بۆیە دەبێ بەوپەڕی بەرزیشیەوە پارێزگاری لێ بکرێت لە گشت هۆکارەکانی رمان و چوونە ناو ئایەڵەندییەکانی و سەر لێشێواندنی.

حەرام کردنی ئیسلام، بۆ کاری ئەڤینی وجنسـی ناشـەرعی بـۆ هەریەکـە لـە جەمسـەرەکانی، (پیاو ، ژن) وا لـە خێزان دەکات کە بە هێمنی و دوور لـە گـیروگرفت و ئاژاوە ژیان بەسـەربەرن، کە ئەمەش زۆر پێویستە بۆ پـەروەردەکردنی منـاڵ، چونکـە پەروەردەکردنی مناڵ پێویستیی بە کات و سەرپەرشتیەکی زۆری ئـەو هێمنـی وئارامیـە هەیە. بە پێچەوانەوە، والآکردنی دەرگای ئـەو قەڵایـە و وەژوورکـەوتنی چاوچنۆکـان دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی پرنسیپی چێژ، یان دڵداری وئەڤینیی رێ پێنەدراو (حـەرام) وزاڵ بوونی بەسەر باری خێزان وهەژاندنی بنەما راگرەکانی پەیوەندی خێزانی دامەزراو لەسەر پەیمانێکی توندو تۆڵی وەفاداری، لە ئاکامیشدا نـەوەی نـوێی (منـاڵان) دەبنـە قوربانی ئەو لێك ترازانەی خێزان ولەدوارۆژیشدا رەچاونەکردنی لەباریان بۆ لە ئەستۆ گرتنی ئەو سپاردەیەی کە پێی دەسپێردرێت بەرامبەر خۆی وگەل وخەڵکی تـر، ئەمـە وێرای بلاوبوونەوەی گەندەڵی لە نێوان بڕواداران و تێکدانی شیرازەی خێزان وکۆمەڵ وسەرهەڵدانی جۆرەها نەخۆشی لەناوبەر وەك ئایدز وئەوانی تر.

لەمڕاستیدا هەڵمەتێکی بـەرفراوانی دارێـژراو لـە ئارادایـە بـۆ گۆڕینـی ئـەو تێڕوانینە قورئانیە بۆ گیروگرفتە جنسیەکان بە شێوەیەکی تایبەتیو، پـەیوەندی پیـاو بـە ئافرەتان بە گشتی، کـە دەزگاکـانی راگـەیاندن چـەند شـێوەیەکی هونـەری وکـەناڵی راستەوخۆی ئاراستەکراو دەخاتـە گـەڕ وبەرهەمـە چـیرۆکی وتەلـەفزیۆنی وسـینەمائی وگۆرانی نا ئیسلامی و بەتایبەتی رۆژئاوایی، کـە لـە رۆژگـاری ئێسـتاماندا کۆنـتڕۆڵی گۆڕەپـانی راگـەیاندنی کـردووە، پـەیوەندی خـێزانی وهاوسـەرێتی وخزمایـەتی لاواز دەکات، بەڵکو لـە زۆربەی کاتەکاندا دەیشـێوێنن وبەکـەم وبـێ مانـای ناودەبـات بـە دەستەواژەی وەها، کە هاوسەرێتی بە قەفەس وبەندیخانە وکۆت وزنجیر پێناسە دەکـات، یان دوا هەوڵی موغامەراتی ناشەرعی جنسی وپـەلامارادان وفرۆشـتنی لـەشو لار یـان شـێوازێکی کۆنـی دامرکـاندنی ئـارەزووە یـان مـەیلێکی سـەرمایەداری بـۆ دەسـت بەسـەرداگرتنی ئافرەت وسوود لێوەرگرتنیان وئیستغلال کردنیان.

ئەمە هەوڵێکە بۆ بە عەولەمەکردنی تێڕوانینە جیا جیاکانی جیهانی بۆ مافی مرۆڤ لەبواری جنسدا لە چوارچێوەی تێڕوانینی رۆژئاوای عەلمانیی راکردوو لە کەنیسە و بیرو بۆچوونی بۆ ئەم مافە. هەندێ لە دڵ نەخۆشەکان بە دەنگیەوە دەچن، کە لەو هەڵمەتە جیهانیەی بە ناوی مافی مرۆڤ وەك هەلێك بۆیان رەخسابێت، بۆ بەرجەستەکردنی تێڕوانینە ماددیەکەیان یان چێژ وەرگرتن لە بەیەك گەیشتنە جنسیەکان، کە پایەی خوێن مژەکان بەرزدەکاتەوە وەك، پەیوەندی جنسی سەربەست، یان بە یارگرتنی (عشیقەیەك)، یان چەند برادەرێك وەك پەیوەندیەك و پەیوەستێکی بەناو پیرۆز (مقدس)ی دارێژراو (هەروەکو ئەوان ناوی دەبەن) لەسەر هەواو ئارەزوو، نەك لە ڕوانگەی لێپسراویەتی وشوێن کەوتنی بنەما رەوشتیەکان. گۆرانی بێ شەرمانە وچیرۆکی داوێن پیسی رێگا دەدەن بە ناپاکی هاوسەرێتی هەریەکەو لە لایەن خۆیەوەو بە ڕەواشی دەبینێت ئەگەر هەر یەکێك لەو دوو هاوسەرە ئەو ناپاکیە ئەنجام بدات‌و کارێکە پڕ لە ئازایەتی وجورئەت. زنجیرە تەلەفزیۆنیەکان وفلیمەکان ئەو دیمەنانە پەخش دەکەن هەروەك نە با بێت و نە باران.

هەروەها منالانی پاشکەوتوو لە داوێن پیسی پێشان دەدات کە بەرهەمێکە و هیچ رەنگدانەوەیەکی هەست وغیرەت نایان بزوێنێ لەو جۆرە پەخشەیاندا...

کەچی بڕواداران وا نمایش دەکەن کە ئاڵۆز رەفتار، وبێ بەخت وخۆیان لە هەموو شتێك هەڵ دەکوتن ومافی ئافرەت لە بواری جنسیدا پێ شێل دەکەن، ئافرەتانی بڕواداری نیاز پاك وبێگەرد وا نمایش دەکەن کە هێشتا چێژی جنسی جۆراو جۆریان نەکردووە ...

ئەگەر بێتو ئەو هەوڵانە لەناو نەبرێن و پووچەڵ نەکرێنەوە، ئەوا بومەلەرزەیەکی ترسناك لە تەلاری بڕوا و پارێزکاری خێزان ونەوە ومرۆڤایەتی سەرتاسەری روودەدات، لە ئاکامیشدا هەمووی دەکەوێتە ناو زەلکاوی داوێن پیسی حەرام هەر بۆ ئەوەی ئیتر بیر لە دۆسیەکانی گەل ونەوە نەکەنەوە ونەتوانن بەرەنگاری چاوتێ برینەکانی دوژمن

بنــەوە، وستوونەکانی بـەرگری بڕوخێنـن، بـە تایبـەتیش نـاوزەدکردنی گیـان بـازی وفیداکاری بەکاری توندوتیژی وتیرۆرسـت، ودامـەزراندن وپـەیڕەوکردنی سـیفەتێکی رامیاری وئابوری ئاسانکار بۆ خراپە وگەندەڵی، کە لـە پێناویا خەبات دەکەن بۆ ئەوەی نەوەی ئیسلامیش، هەمان شت بچێژێ کەنەوەکانی تر چێشتویانە لـەو سـزا خواییانـە، ئەگەر هاتوو پەڕۆی سپیان بەرزکردەوە (تسلیم بوون) بۆ ئـەو بانگێشـتە گوناهکاریـە، ودووچاری خەریك بوون بە دوای رابواردن بـوون، و ئەمانـەتی چاکـە و چاکـەکاری بەجێ نەگەینن وتێ نەکۆشن لـەپێناو چەسپاندنی فەرمانڕەوایی لـە ژێـر (بما أنـزل الله) و رزگـارکردنی وڵات لـە مەترسـی عەولـەمـەی جنسـی کـە جوولـەکـە وئەوانـەی هەڵگەڕاونەتـەوە لـە (ئـەهلی کتـاب) وکـافر بوونـە، هـەوڵی بـە جیـهان کردنـی وبڵاوبوونەوەی دەدەن !!!

## گۆرانی هونەرێکی قەشەنگ و بەرپرسیارە

یەکێ لەمافەکانی مـرۆڤ ئەوەیـە کـە دڵـی خـۆی خـۆش بکـات، و خـۆی بحەوێنێتـەوە، وماندوویـەتی برەوێنێتـەوە، دوای ئـەو هـەموو شـەکەتی و مـاندووبونی رۆژانەیی لە ژیانی کارکردندا، بە حەساندنەوەی بینین، وەك نیگاکردنی دیمەنی جـوان، وبیسـتن، وەك بیستنی قورئان خوێندنەوە، سرودێکی بەپێز، گۆرانیەکی پاك و بێ گـەرد، وبۆنکردن، وەك بۆنکردنی دەسکە گوڵێکی بۆنداری بەهار، یان بـەکارهێنانی گـوڵاوی بۆن خۆشی جۆراوجۆر، و چێژوەرگرتن، وەك خواردنی خواردەمەنی جۆراوجۆر بەپێی توانا ونۆشینی خۆشاو وشەربەتی بەتام، بەمەرجێك هیچ گۆڕانکاریەکی کمیکی بەسەردا نەهاتبێت.

لەوەی پـەیوەندی هەیـە بـە جوانکـاری بیسـتن، ئـەوا هونـەری گۆرانـی بەشێوەیەکی دیـار و روون لـە راگـەیاندنی ئـەمرۆماندا بەرچاوەدەکـەوێت، وە ئەگـەر

مرۆڤ نەتوانێ دەست بەرداری ئەو جۆرە هونەرە بێت، کە گفتوگۆ لەگەڵ هەستەکان
دەکات وخۆشی دەخاتە دڵ ودەروونیەوە، ئەوا هۆکارەکانی راگەیاندن ئـەو پێداویستیە
مرۆییەیان قۆستۆتەوە لەزۆربەی کاتەکاندا، نەك بۆ بوژاندنەوەی فێرەی ئیمانی و رازی
کردنی هەستە رەوشـتیـیەکان و رواندنـی خوێـن گـەرمی وریزبـەرزی لـە دڵـەکاندا،
ئامادەکردنیان بـەرەو گۆرەپانی جیهاد لـەپێناو خـواو پاریزکـاری کردنـی وڵات لـە
مەترسیەکان وبەرزکردنەوەی هەستی جوانکـاری ومرۆڤایـەتی، بـەڵکو بەپێچەوانـەوە،
هەست ونەستەکانی پێ سڕکرا، ئارەزووی نـارەوای بوژانـدەوە، بیلبیلـەی چاوەکـانی
زەهراوی کرد، گەلانێکی، بـێ هـۆش وخـەریك کـردوە لـە بیرکردنـەوە لـە دۆسـیە
سەرەکیەکان، بەدەنگە نەرمەکانیان، وشە ئەڤینی ودڵداریەکان، وئاواتە ئەفسانەییەکان،
وئارەزووە جنسیەکان، وبەسەرداهەڵگوتنی بۆشی سەرکردەکان، ومۆسیقا وئیقاعـاتێکی
بزوێنەری بێ نۆتەی تیژ.

لێرەدا دەتوانین نموونەیەك بخەینە بەرچاوان، بۆ لاوانـی هونـەری گۆرانـی لـە
رۆژگاری ئێستاماندا، بە ئەو (سيدة الغنـاء العربـي)ەی کـە دەسـتی داگرتـووە بەسـەر
هۆکارەکانی راگەیاندن بۆ دەیان ساڵێکە، گۆرانیەکان، ووشـەکانی زیـاتر لایـەنی وون
بوونی، هەست و بیری تیا دەدرەوشێتەوەو، هانی پەلاماردانی چێژوەرگرتن دەدات، بەر
لەوەی لەدەست دەرچێ، وجێ هێلانی واقیع بە هەموو خۆزگە و ئێش و ئازار و بـیر و
بۆچوونەو، سکالاکردن لە ژیان لە کاتێکی وەهمیدا، کە لە زۆربەی کاتـەکاندا زیـاتر
لە دەیان خولـەك دەخایـەنێت، لـەو کاتەشـدا گوێگـر تەنـها بـیر لـە خۆشەویسـتی
دەکاتەوە، کە هەریەکە بە گوێرەی مەیل و پەیوەندی تایبـەتی خـۆی گـوێی بـۆ شـل
دەکات و لەگەڵیدا دەچێتە جیهانێکی تر، گۆرانیەکانیش وەرگیراون لە روانگەی ئـەو
خۆشەویستیـیەی کە چوارینەکانی عمری خەیام باسـیان لێـوە دەکـات، لـێرەدا چـەند
دێرێکی ئەو چوارینانە دەخەینە بەرچاوان!

| | |
|---|---|
| لاتشغل البال بماضي الزمان | ولا يأتي العيش قبل الاوان |
| واغنم من الحاضر لذاته | فليس في طبع الليالي الأمان |
| غدٌ بظهر الغيب واليوم لي | وكم يخيب الظن من المقبل |
| اطفى لظى القلب بشهد الرضاب | فانما الأيام مثل السحاب |
| وعشنا طيف خيال فنل | حظك من قبل فوات الشباب |

هەروەك لە وەرگێڕە كوردیەكەی مامۆستا هەژار دا هاتووە و دەڵێ:-

١) چیم بیستووە لەم جیهانە یان چیم دیوە
زانیومە چییە، هیچ نەبێ نیوە و نیوە
مردن چیە؟ هەرچی دەكەم و دەگەڕێنم
شێواوم و سەر نابەمە دەر لەو شێوە

٢)لەم هاتنە بێهودەیە بیرم شاشە
سەرباری خەمان بیروخەمی لەو لاشە
مەی گێڕ وەرە قوڵ هەڵكە گلێنەت بێنە
خەم چڵكی دڵە، بەمەی بشۆرێن باشە

٣)بێ دلبەر ومەی تەمەن بەسەر چوون هیچە
بێ رەنگی مەی ودەنگی بلوربون هیچە
ئازاد و بەدڵخۆشی بژی چەند رۆژێك
رابوێرە لە هیچ بیرمەكە، گەردوون هیچە

٤)مەی گێڕ وەرە بۆم تێكە ئەوا نیوە شەوە
بەس بیری لە مزگەوت وكەنشتان بكەوە
دڵتەنگی جەهەنەمی وبەئاواتی بەهەشت
دای ناوە خودا كوێنەدەری. بەس لێكی دەرەوە

بەم جۆرە، ئەو هونەرمەندە کرا بە پەرستراوێکی جەماوەر، و گۆرانیەکانی پالوتکەی هونەر دادەنرێت!!! و وشەکانی بوون بە دروشم وفاکتەرێکی دروست کردنی حالەتی هەست پێنەکردن، کە کار لە گەورە وبچوك بکات!!! و ئەو گۆرانیانەش لە ساڵەکانی بەر لە شکستی حوزێران بەرهەم هێنراون، یان دوای شکستە کە، و شەوانی ئاهەنگەکانی ئەو (هونەرمەندە) شەوانێك بووە پڕ لە مەی نۆشین و بەڵپەڕکێ وسەما، هەروەك یەکێك لە پاڵەوانەکانی رۆمانەکەی (نجیب محفوظ) بەناوی (میرامار) دەوری دەبینێ.

د. عبدالسلام العجیلی لە نووسراوێکیدا کە لە گۆڤاری (الاسبوع العربی) دا ژمارە (٥٨٨)دا بلاوی کردۆتەوە لە ژێر ناونیشانی (لەژێر ئاسمانی بەعلەبەگدا)، کە چۆن ١٢٠٠ چەکدار تەرخان کرابوون بۆ پارێزگاری کردن وپاسەوانی کردنی یەکێك لە ئاهەنگەکانی هەسارەی رۆژهەلات (کوکب الشرق)، ئەو ئاهەنگەی کە پیاوەکان هەر بە مەی خواردنەوە ولەیەك هەڵدان نەوەستان، بەڵکو سەربازەکان شووشە (بطل)ی وێسکی وعەرەقیان لە جانتای ژنەکانیش هێنایەدەر ... !!! بۆیە هەندێك وای بۆ دەچن کە ئەو سرو خاویەی کە ئەو هونەرمەندە دروستی کردبوو هۆیەك بوو لە هۆیەکانی شکست هێنانی موسولمانان لە حوزێرانی ساڵی ١٩٦٧ ... ئێستاشی لەگەڵدا بێت چەند ئێستگەیەکی رادیۆ کاتێکی دیاری کراوی نەگۆڕی تەرخان کردووە لە بەرنامەکانیدا بۆ پەخش کردنی گۆرانیەکانی ئەو هونەرمەندە، لە شەوانی ئارام وهێمن دا، کە دەبێ ئەو کاتانە سوودیان لێوەربگیرێت بۆ خواپەرستی وتەسبیحات وحەوانەوە ودڵنارامی وتێ فکرین لەو بارە گرانەی کە موسولمان دووچاری بونەتەوە لە ژێر دەستی بێگانە ودوژمناندا، لەو ئێسگانەش، رادیۆی (ئیسرائیل) کە تاکو ئێستاش گۆرانیەکانی پەخش دەکات بەر لە خوێندنەوەی درێژەی دەنگوباسەکانی شەو، بە مەبەستی وەدیهێنانی دوو مەرام، یەکەم، سرکردنی گوێ گر وخستنە بەرچاوی ژیان وەك ئامانج

ومەبەست وخۆشی ورابواردن، وە دووەم، هاندان بۆ گوێگرتن لە دەنگوباسە ژەهراوی وپڕوپاگەندە شێواندراوەکان.

تا ئەمڕۆش دەزگا تەلەفزیۆنیەکان ورادیۆییەکان وهەندێك لە دەزگاکانی ((رۆشنبیری)) هەوڵی بەرز وناوداركردنی گشت كچە گۆرانی بێژەكان دەدەنو، بەرگێكی پیرۆزی خەیاڵیان لەبەردەكەنو، بە دەنگ خۆش وبەهرەمەندیەكەی هەڵدەقۆزنەوە بۆ خەریك كردن وبێ هۆش كردنی لاوەكان، و وێنەكانیان لەسەر بەرگی گۆڤارەكاندا بڵاو دەكەنەوە بۆ فریودانی خەڵك بە كڕینی زۆرترین ژمارەو، پڕوپاگەندە فێركردنیان بۆ جل و بەرگی كورتی ڕۆژئاوایی یان نیمچە ڕووت، یان لەگەڵ وێنەی چەند هونەرمەندێكو ئەكتەرێكی تر، هەم دیسان چەند هونەرمەند لێك دەدرێن بۆ فرۆشتنیان وەك نموونە بۆ ئەوەی لاساییان بكرێتەوە یان لەپاڵ چەند بابەتێك كە باس لە جنس دەكات.

گۆرانیەكانیش هەمەجۆر و ڕەنگاو ڕەنگن هەر لە عربی، كوردی، توركی، هندی، فارسی و بیانیەكانیش، هەر زۆربەشیان لە دەوری یەك تەوەردا دەخولێنەوە كە باس كردنی ئافرەت و بەژن و باڵا و جوانی ئەندامەكانی لەشیەتی، كە دەبنە هۆی جۆشدانی ئاگری جنس و دڵداری و پەیوەندییەكی نارەوا ... ئەمەیان گۆرانی بەسەر هاوسێیەكەیاندا دەڵێت، لەو كاتەدا كە ئایینی پیرۆزی ئیسلام گرنگییەكی زۆری بە مافی هاوسێیەتی داوە و دەبێ پارێزگاری لە سامان و ناموسیان بكرێت. كەچی ئەمەیان بەو پەڕی سنووربەزاندن و هەوڵی لە خشتە بردنی كچە دراوسێیەكەی دەداتو دەیەوێ ئابڕوویان بەرێت، هەربگرە لە (ماڵمان ماڵێكە دیوارمان بەینە ......... هەتا......... یارامن مەكتەبلییە جیران جیران).

ئەوەی تریان گرفتاری دەردی ئەڤینی ژنێكی شوورداری دایكی حەوت مناڵ بووەو هەوڵی پەلاماردانیەتی و ئەگەر خاوەن حەوت مناڵیش بێت هەر بەتەماتم و مێردە گولە ... و تێكدانی خێزانی ئاوا ئارام و بەیەكەوە ژیاو، و لە دوایشدا دەبێ

چارەنووسی ئەو حەوت منالّە چی بەسەر بێت کە دایکیان لـــە خشـتە بـراوە و (رەدو) کەوتوە؟!

یەکێکی تر راستەوخۆ رکابەرایەتی فەرمانی خوداو پێغەمبەر (صلــی الله علیـه وسلـم) دەکات، کە فەرمان بە ئافرەتانی موسولمان دەکەن بە پۆشینی پالا پۆش، ئـەویش دەڵێ: ((شـەرمی پێ ناوێ پەچەکەت لادە))

یان زەهاوی لـە شیعرێکی‌دا هاوار دەکات:-

| | |
|---|---|
| قال هل في السفـور نفـع يرجي | قلت خير من الحجاب السفور |
| انما في الحجاب شـــك لشعب | وخفـاء مـن السـفور ظهور |
| كيف يسمو إلى الحضارة شعب | منــه نصـف عن نصفه مستور |

بەم جۆرە گۆرەپانی گۆرانی بێژتن پردەبێــت لـە قوربانیـەکان وەك بـدرەکانی جەنگ، یەکێك لـــەولاوە کـەوتووە کـوژراوی یـارە، یـەکێکی تـر زامـدارە وخوێنــی لێدەچۆرێتەوە، یەکێك دیل وئەسیری داوی زولفی یارەکەیەتی، وئەوی تریان لەو گرمە گرمە وبەیەك دادانە سەری لێ شێواوەو وێل ودێوانە بووە، چونکە یارەکەی لـە هـەمان گـەرەك وشـوێن نـەماوەن وبارگـەیان تێـك نـاوە بـەرەو کوێســتان یـان گـــەرمیان رۆیشتوون!!!.

هونەرمەندێك بەسەر کچی هەولێری‌دا گۆرانی دەڵێت، یەکێك بەسەر کچــی کورد، هەندێکیان دەست بەرز دەکەنەوە زوو تەسلیمی داواکاریەکانی دڵداری دەبن و مل پێچی لێ ناکەن، یەکێکی تر ئاگرەکەی دەکوژێنێتەوەو هەرەشە لە یارەکەی دەکات بە پچراندنی پەیوەندییەکانی‌و، سەنگەرەکەی دەگوازێتەوە بۆ لای یارێکی تـر هـەروەك کارێکی زۆر ئاسایی، نەغمەکانیش رۆژ لــە دوای رۆژ لــە زیـادبووندان لـەکارتێکردن

وخێرایی ورووژان، کە تەعبیر لە ئارەزوویەکی زاڵ بووی لاسـاییی کردنـەوەی ڕۆژئـاوا دەکەن.

سەیرە هەر هەموویان دژی هۆشیارین، هـەر هـەموویان بانگێشـتەی سـڕبوون وسەرخۆشی دەکەن، هەر هەموویان بانگی بەیەکگەیشتنی کچ و کـوڕ دەکـەن بـەرەو تێکـەڵاو بـوون ... و هاواردەکـەن، دەوەرنـە ڕابـواردن ... بەرنامـە وپڕۆگرامـەکانی ڕاگەیاندنیش هەر ئاگری ئارەزوومەندی ... جۆش دەدەن، و هیچ دووربینیەکیش ڕەچاو ناکەن لە کارتێکردنی ئەو جۆرە گۆڕانیانە لە گەنجە تازە پێگەیشتوەکان، بە شێوەیەکی تایبەتی.

## کەناڵە ئاسمانیەکان و تاقیکردنەوەیەکی سەخت

لە ڕاستیدا ئەوەی کە لەڕێگای مانگـە دەسـتکردەکانەوە پـەخش دەکرێـت، لەگەڵ ئەوەی کە چەند بەرنامەیەکی ڕەسەنی تیایە لە هەندێك لە کەناڵەکانو، ئەوەی کە کەناڵی (اقراء) پێی هەڵدەستێ لەبەرەسەن کردنی ڕاگەیاندنی ئیسلامی. بەڵام ئەو بیرو بۆچوونە جیاوازانەی کە کەناڵە جۆربـەجۆرەکان پەخشـی دەکـەن، ناسـراوە بـە سیاسەت کردنی ڕاگەیاندن، کە بەکارهێنانی لەپێناو پـەرەپێدانی عەلمانیـەت ومەبەسـتە بێهۆش کەرەکاندایە، کە زۆر لە ڕاستگۆیی و وردەکاری وپڕۆگرامیەوە دوورن، ئەمـە بە گوێرەی ڕاگەیاندن لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا، کە چی کەناڵەکانی پەخشی ئەمـەریکی وجولەکە و ڕۆژئـاوا کـەوا هـەوڵی بـە جیـهانیکردنی بـیرو ژیـرو هەستەکان دەدەن وچالاکی ودەسەڵاتێکی فراوان بەگەر دەخەن بۆ کەسب کردنی ڕای گشـتی جیـهانی، کە بەسوودی وڵاتەکانیان بگەڕێتەوە، دوورە لـە هـەق وچاکـە وبـەرژەوەندی گـەلان ونەتەوەکانی تر. ئاینی پیرۆزی ئیسلام، دژ بە سوود وەرگرتن لە تەکنەلۆژیای نوێ نیە، وخـەڵکیش بـێ بـەش ناکـات لـە وەرگرتنـی کـار وگوفتـاری جـوان و ڕێـك لـە

خاوەنەکانیان، وە گومانیش ناخاتە بەردەم پێشکەوتن بەرەو باشتر، و ئەو هۆکارو ئامێرانەی کەبەرهەمی ژیری مرۆڤن، دەکرێ بە لایەنە چاکەکانەوە سوودیان لێوەربگیرێت و، لەشەڕو دەرد وئازارەکانی خۆمان بپارێزین.

بۆیە لەسەر سەرپەرشتیارانی راگەیاندن پێویستە بەرنامەیەکی باش ولەبار دارێژن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو رەوتە وخۆ بەدەستەوە نەدەن، هەروەها چۆنیەتی مامەلەکردن لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە کەناڵە بازرگانی وجنسیە رۆژانەیی وپڕپاگەندەیی‌یەکان پەخشی دەکەن، هەروەها دیاریکردنی چۆنێتی پێشوازی کردن لە بەرنامەکانیان وئەوانەی کە لە بەرژەوەندی نەوەدان ولە ئایینەکەیان دایان نامالن و رەوشتە گران بەهاکان لەناو دەبات، بۆیە پێویستە ئەوانەی کە کار دەکەن لەسەر ئەو جۆرە پەخش وەرگرتنە ئاستێکی باشی بڕواو پارێزکاریان هەبێت وتایبەتمەندیەکی زانستیان هەبێت لەو بوارەو لەگەڵ، زانیاریەکی باش دەربارەی مەبەست وئامانجەکانی راگەیاندن، بەلاَم بەجارێ سەربەست کردن ولەسەر پشت والاکردنی دەرگا بۆ ئەو جۆرە کەنالانە، بێگومان سەربەرەو لەناوچونێکی ترسناك وبلاَوبوونەوەی گەندەڵی خراپەکاریەکی زۆر دەبا، کە ئاکامەکانی باش نابێت وشتی باشیشی لێ رەچاونـاکرێت ... ﴿فَلْيَحْذَرْ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أمْرِهِ انْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ اَلِيمٌ﴾ (النـور / ٦٣) وە ﴿وَقِفُوهُمْ إنَّهُمْ مَسْئُولُونَ﴾ (الصافات / ٢٤)

کەواتە، ئەی باوکان ... ئەی دایکان. باش بزانن کە ئێوە بەرپرسیارن لە بەرامبەر ماڵ وکوڕ وکچەکانتان لە رۆژی دواییدا، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَاأيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أنفُسَكُمْ وَاهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا امَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ (التحريم / ٦).

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((ألا كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته، فالأمير الذي على الناس راع، وهو مسؤول عن رعيته، والرجل راع

على أهل بيته، وهو مسؤول عنهم، والمرأة راعية على بيت بعلها و ولده، وهي مسؤولة عنهم ... )[٤٨].

بۆیە کڕینی ئامێری (سەتەلایت) وبەکارهێنانی بەوشێوەیەی کە ئێستا لە ماڵاندا بەکاردەهێنرێت، کە منداڵ وتازە پێگەیشتووی کوڕو کچی تیایە و لەگەڵ ئێوە سەیری دەکەن، یان لە دوای دەرچوونتان سەیری ئەو بەرنامانە دەکەن کە ئارەزوویان لێیەتی، بێگومان هەرچۆنێك کاریان لێدەکاتو کار لە بیرو بڕوا وپارێزکاریەکەیان دەکاتو، زۆریش دەگمەنە کە نەك ئەوان، بەڵکو ئێوەش لە زیانەکانی رزگارتان ببێت، بۆیە واچاکە دەرك بە مەسەلەکە بکەن بەر لەوەی لە دەستان دەربچێت. دەتوانن بەرنامە ووانە و وتاری سوودمەند بۆ منداڵەکانتان بەر دەست وئامادەبکەن لە رێگای بەکارهێنانی کۆمپیوتەر، تۆمارکەر، کتێب و نامە دڵ کەرەوەکانو برادەرو دەستە خوشکی چاكو خاوەن باوەڕ، وایان لێبکەن کە کاتەکانیان بەشتی سوودمەند بەسەربەرن وەك لەبەرکردنی قورئانو تێگەیشتنو، لەگەڵیا ژیانو بەرجەستەکردنی لە ژیانی رۆژانەیاندا، و هەروەها وەرزشی سوودمەند بۆ بنیات نانی لەش و تەنێکی پتەو و دروست و هونەری پاك و خزمەتکردنی خێزان و کۆمەڵ. وە لە روالەتەکانی تری راگەیاندنی رۆژگاری ئەمڕۆماندا کە کۆمپانیاکانی جوولەکە و رۆژئاوایی بۆ بەرهەمهێنانی بەرهەمی تەلەفزیۆنی سینەمایی بەرێوەیان دەبەن، لەشو لارو دەنگە ناسکەکەی ئافرەت هەڵدەقۆزنەوەو دەیانکەن بە تەوەری سەرەکی لەبەرهەمەکانی شیعریو ئەدەبیو شانۆگەریدا، ئەویش بۆ وروژاندنی ئارەزووی جنسی لە لایەن خەڵکەوە و لەبەین بردنی بنەماکانی ئیمانیو رەوشتو جیهادکردنو بەنۆکەرکردنیان بۆ گەلی (المختار)ی ئەفسانەیی.

ئافرەت وەك کاڵایەك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت بۆ بەدەست هێنانی قازانج، و ئەکتیڤێك بۆ سەرف کردنی کاڵاکانیان، هەرشتێك کە بیانەوێت بەهەرمێن بێت، ئەوا وێنەی ئافرەتێکی لۆخت یان نیمچە لۆختی لەسەر چاپ دەکەن، یان بە دەنگی

ئافرەتێك، پڕوپاگەندەی بۆ دەكەن ؟!!! بەڵام چلوە برسیەكان وئارەزووە پەلاماردەرەكان هەر تەنها چاو دەكەنە ئەو شوێنە دیارو سەرنج راكێشەرانەی ئافرەت زیاتر، نەك بۆ ئەو بابەتەی كە پڕوپاگەندەی بۆ دەكرێت.

فلیمەكانی تەلەفزیۆنی و زنجیرەكان، ئەوەی كە (سەتەلایت) پەخشی دەكات، ئەو بابەتانەن كە زۆر باس لە سامان، وخۆشەویستی، و ناوبانگ دەركردن وهێز دەكەن، جا سامان كۆكردنەوە بەهەر رێگایەك بێت، خۆشەویستی هەرچەندە حەرامیش بێت، یان ناپاكی كردن بێت لەگەڵ پەیمانی هاوسەریەتی، ناوبانگ دەركردنیش هەرچەندە لەسەر حیسابی هەق و ژێر دەستەكانیشەوە بێت، یان لەسەر ماف خواردنی تەمبەل ونەزانەكانیش بێت، هێزیش هەرچەندە لەسەر ماف خواردنی گەلان وخوێن مژینیان بێت.

خۆشەویستی و ئەڤینی وەك بەهێزترین سۆز نمایش دەكرێت، وەك ئەوەی كە هیچ هێزێك نەبێت ببێتە كۆسپ لە رێگایدا، وهیچ داب و نەریتێكی كۆن و دواكەوتوو، وە یان خۆ خۆیەك وخۆویستیەك (انانیە)ی نێرانە، و یان ستەمێكی كۆمەڵایەتی، و یان بەساڵاچوویەك كە لە سۆزو دڵداری كوڕە لاو و كچە شوخێك تێنەگەن، وە یان ئایین، بگرە شوەكەش (مێرد) كە وەك كۆنەپەرست وەسفی دەكەنەوە، یان دایك و باوكی كە پەروەردەیان كردووە ئیتر هەست بە ئارەزوو ناكەن، هەموو ئەوانە ناتوانن لەبەردەم ئەم خۆشەویستیە بوەستن!!! هەروەها لە چۆنیەتی خۆشكردنی رێگا بۆ هاندانی دڵداری، دەڵێن وجەختیشی لەسەر دەكەن كە هاوسەریەتی بەبێ دڵداری پێش وەختی، دووچاری شكستی دێت وسەركەوتوو نا بێت؟!!! و ئەو كچەی بێ خۆشەویستی شوو بكات سەركەوتوو نابێت، و ژن هێنانی زوو لە تەمەنی گەنجیدا هەرگیز سەركەوتوو نابێت لەبەر كەمی كارامەیی لە بواری جنسدا ...... تا وای لێهاتووە كە لە فلیمە كارتۆنیەكانیشدا بەس هەر باسی خۆشەویستیە، هەر لە سەرەتاوە بە دەستەواژەو ناوەڕۆكەكانیەوە. ئاكامی تاڵی ئەو فلیمانە كە بینەران

بەدیاریەوە شەوخونی دەکەن بە پیاو و ئافرەتەوە بەوپەری پەرۆشیەوە، ئەو گەندەڵیە بوو، کە تەنیوەتەوە، لە نێوان پەیوەندیەکانی ژن ومێرددا بەشێوەیەکی بەر چاو، و سەرهەڵدانی جۆرە تاوانێك کە لە وڵاتانی موسوڵمانان بە درێژایی مێژووی کۆن ونوێدا نەبیستراوو و نەناسرابوو، وەك جووت بوونی (نعوذ باللە) باوك لەگەڵ کچەکەی، دایك لەگەڵ کورەکەی، برا لەگەڵ خوشکەکەی، مام لەگەڵ برازا، خاڵ لەگەڵ خوشکەزا، ونێر لەگەڵ نێر، ئەتك کردن و پەلاماردانی کچی تەمەن بچوك وتازەپێگەیشتوان و کەوتنیان بۆ ناو زەلکاوی داوێن پیسی بەر لە ژن هێنان وەیان شووکردن. سزاکان و یاسا دەستکردەکانیش ناتوانن رێگا لە سەرپێچی کەران بگرن لەبەر بێ توانایی کاریگەرییان، یان لەوانەیە لە بنەرەتەوە بە تاوانی نەزانن. وە داوێن پیسی لەفەرهەنگی رۆژئاوادا سزای لەسەر نابێ ئەگەر هاتوو بە رەزامەندی هەردوولاوە بێت، یان کارەکە ئەنجام بدرێت لە بەرامبەر کرێ!!! یان ئەوەی کارەکەی ئەنجام داوە تەمەنی لە (١٨) ساڵان تێپەڕبوبێت، وەیان (زینا) هەر بە تاوان دانانرێت، ئەگەر هاتوو مێردەکەی داوا لەسەر ژنەکەی خۆی تۆمار نەکات و (یاسا)ی (دەستکرد)یش سزای نادات!!! وە ئەگەر هاتوو دیسان پڕدانە ژنێك (أغتصاب)، پیاوەکە پەیوەست بوو بە مارەکردن وهێنانی ورازی بوو بە هاوسەریەتی لەگەڵیا، ئەوا لە سزاکەی دەبووردرێت، بەو مەرجەی تا بەسەر چوونی سێ ساڵ پیاوەکە داوای دەست بەرداری (طلاق)ی لێ نەکات، ئەمە لە هەندێك لە یاسا دەستکردەکاندا.

## تەلەفزیۆن دەیەوێت ببین بەچی؟

زانایان و پسپۆڕان بە تەواوی دەرکیان بە کاریگەری تەلەفزیۆن کردووە لەسەر، لەبارنبردن وشێواندنی رەوشتی منداڵ، چونکە ئەو ساڵە سارەزایی وزانیاری لە رێگای دوو هەستەوە بە دەست دێنێت، بەزۆری چاو وگوێ، بۆیە بڕگەکانی راگەیاندن

زاڵ دەبێت بەسەر هەست وهۆشیدا، ئەو برگانەش بێبەش نین لە ناهەمواری وبەدرەوشتی وچەند دیمەنێکی جنسی کە فلیمەکان بەزۆری ناوەڕۆکەکانیان هەر لەو شعانە پێك هاتوون.

د. سپوك دەربارەی تەلەفزیۆن ولەوەی پەخشی دەکات دەڵێ: ((خەریکە هەندێ جاران تەلەفزیۆنەکەم بشکێنم، بۆ دەربڕینی شۆڕش ودڵتەنگیم، کاتێ دەبینم منداڵەکەم (مالق) چاوەکانی بڕیوەتە دیمەنێکی (غەرام)ی تەواو، و کاتێك هێرش دەکرێتە سەر پەردە (بکارە)ە کچێك لە منداڵیەوە، وەیان کاتێ زنجیرەیەکی سەر سوڕهێنەر پەخش دەکرێت دەربارەی تاوان وچۆنیەتی ئەنجامدانی وجیبەجێ کردنی وداهێنانیدا)[٤٩].

وە لەبەر خێرایی کارتێکردنی ئەو دیمەنانە لە منداڵ، وای لێدەکات کە لە زۆرترین کاتەکاندا لاسایی هەمان شت بکاتەوە و جێبەجێی بکات لەسەر نزیکترین خاڵ، کە بەدەستی دەکەوێت، وەك ماچ کردن ولە ئامێزگرتن و لەگەڵ خەوتن، وە بەکردار چەندین رووداوی لەو جۆرە روویداوە.

وە دەنگی تەلەفزیۆنی (ریاباز) لەسەر حیسابی دەنگی قورئان وکاتەکەی بەدیارکەوتووە. چونکە قورئانی پیرۆز لەناو ماڵدا هەر نیە، ئەگەر هەشبێت ئەوا تەنها بۆ (تەبەروك) و پاراستنی ماڵ وئۆتۆمبێلە، یان بۆ سەلامەتی گەشتێکە کە لە بنەڕەتدا هیچ مەترسی تیا نیە ونایەتە رێگایان. بەلام دەنگی تەلەفزیۆن ئەو ناوەی ئاوەدان کردۆتەوە!!! و تا دەرەنگی شەو هەر بەردەوامە.

زۆر جاران ئەگەر یەکێك بیەوێت نوێژ بکات، ئەوا روو دەکاتە دوو رووگە (قبلە)، یەکێکیان (کعبە)ی پیرۆز، ئەوی تریشیان شاشەی تەلەفزیۆنەکەیە، چونکە لە کاتی نوێژیشدا بەلاچاوێکەوە!!! هەر سەیری دیمەنەکانی دەکات وناتوانێت بێبەش بێت لێیان!!!.

وە لەبەر خاتری خەڵکی ماوەی (ئاینی) دانراوە لە بەرنامەکانی تەلـــەفزیۆندا کە زۆر لاوازەو بەو ئاستە نیە کە بتوانێ کار لە بینەران بکات و بڕوادارێکی راســت و دروســت، بنیهات بنێ کـە بتوانـێ بەندایـەتی بـۆ ملـهوران، وەلآدات، وکڕنـوش بـۆ پەیکـەرەکانیو وێنـەی کەسـایەتی فـەرمانڕەواو سـەرکردەکان نـەبات، شـوێن حـەزو ئارەزوەکانیان نەکەوێت وبیروڕاکانیان پەسند نەکات. بەڵکو ماوەی (نا ئـایینی)یەکەیـە کە کاردەکاتە سەر بینەران وبەشێوەیکی زۆر نەرم وفێڵبازانە گشت ئـەو شـتانەی کـە بینەر وەریگرتبوو لە مـاوەی (ئـایینی)یەکـە (موگناتیسـی لێدەدات ودەیسـڕێتەوە)[٥٠]، ماوەی ئاینەیەکەش بەپێی پێوەرو پێداویستی فەرمانڕەوای فەرمان بەدەست، یـان لـەو لایەنەی کە سەرپەرشتی کەناڵە تەلەفزیۆنیەکە دەکات پەخش دەکرێت و، نەخشەی بـۆ دادەنرێت و، چەند کەسایەتیەکی دیاریکراو ئەو ماوەیە بەڕێوە دەبەن.

## بەندیخانە وسیحر وئەفسانە لە راگەیاندنی هاوچەرخدا -کاریگەری وزیانەکانی-

ئەم نەتەوەی ئیسلامە، لەچەند چــەرخێك وزەمـانێکی مێژوویـدا، دووچـاری شێوەیەکی لاوازی وبەستەلەکی فیکری وزیاد رەوی کردن لــە بەدیارخســتنی هـەندێ مەسەلەی غەیبی، دوور لە تێڕوانینی قورئان وسونەتە دروستەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆتەوە، هەروەها تەفسیراتی خورافی ئەفسانەیی دامەزراو لەســەر خـەیاڵی چەند رووداوێك ونەخۆشیەیە مرۆییەکان وڕووداوە گەردونیەکان. وە بـۆ ئـەم حاڵەتـە هۆکاری ئیمانی، پڕۆگرامــی رامیـاری، زانسـتی کۆمەلایـەتی وئـابووری جۆراو جـۆر هەبوون.

ئەو (شیطان)ەی کە لە قورئان وسوننەتدا باسی لێوەکراوە، رۆڵێکـی زۆر لـە خۆی گەورەتری دراوەتێ، یـان کارەکـەیان گۆشـەبەند کـردووە لــە چـەند بوارێکـی

دیاریکراودا کە پەیوەستە بە گوزەرانی رۆژانەی خەڵك وهەندی لە مامەڵـەکانیاندا، و لەو کارە گەورەو ترسناکانەی کە ئاماژەیان پیّ کراوە لە قورئان وفەرموودەکاندا پشت گویّ خراونو لە شەیتان دوورکراونەتەوە.

هەنگاو نراوە بۆ بەکارهێنانی چەند هۆکـارێکی هەسـتی بـۆ بـەرگری کـردن ورێگانەدان بە جنۆکە، لەوەی کە بتوانیّ بچێتە ناو گیان و جەستەی مرۆڤ! کـە ئـەو جۆرە کارە پەیڕەو نەکراوە لەناو موسوڵمانانداا، نـە لـە سـەردەمی پێغەمبـەر (صلـى الله علیه وسلم) و نەلە سـەردەمی جێنشـینەکانی (ڕەزای خوایـان لیٚبیّـت). هـەندێك لـە خەڵکان، پەنایان بردە بەر هەندێکی تری شوێن کەوتوانی شەیتان، بۆ بەتاڵ کردنـەوەی پلانەکانی شەیتان، وەك ساحرو کاهینو جادوکەرو ناولەپو فنجان خوێنەرەوەکان ... لە کاتێکدا حزبە شەیتانیەکانی جولەکـەو نـەصاریو هەڵگـەڕاوەکان کـاری نـاڕەواو گەندەڵی لە جیهاندا بلاو دەکەنەوەو وێرانی دەکەن.

هەندێك ویستیان بچنە ناو جیهانی جنۆکە کە خوای گەورە بەرزەکێکی داناوە لە نێوان جیهانی ئێمەو جیهانی ئەوانو دەستیان کرد بە پەیوەندی کردن بە شەیتانەکانی پەرتو بلاّوە بـوو لـەم جیهانـەماندا، کـە پـەیامیان لیٚوەردەگـرنو هـەروەها وشـەی رازاندراوەو بانگەوازو بەیاناتو دەنگو باسو هەواڵو بیروبۆچونەکان ... کە ئەمـەش بە هیچ جۆرێك لە پڕۆگرامە قورئانیەکەو کارکردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسـلم) دانەبوەو نی‌یە.

قورئانی پیرۆز بە راشکاوی رایگەیاندوە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە رێگای سروشەوە پیّی راگەیاندراوە کـە چـەند نەفـەرێك لـە جنۆکـە گوێیـان لـە خوێندنەوەی قورئـانی پـیرۆز بـووەو باوەڕیـان پـیّی هێنـاوەو، بـەهیچ جۆرێـك بـاس لەوەناکات کە حیوارو گفتوگۆ لــە نێوانیـاندا بووبێـت، یـان بـە قوڵـی چووبێتـە نـاو چۆنیـەتی جیـهانیان، هـەروەك لـەمـەو دوا باسـی لێـوە دەکـەین بـە پشـتیوانی خـوای بالادەست.

هەروەها بەم جۆرە، هەندێك جار بە روونی ووشە، بێ جیاكردنەوەی باوەڕدار لە كافر چەند شتێك دەدەنە پاڵ جنۆكەن وەك، نەخۆشـــیەكانی خوگرتـن (الصـرع) و بوورانەوە، و وون بوونی كەسانێك كە گوایە دەستی جنۆكەی تیا بێت لە ڕفاندنیان!.

شایانی باسە مەسەلەكە گەیشتە ئەو رادەیەی كە پەیوەندیەكی بەیەكگەیشتنی (غـەرامی) هـەبێت لـە نێـوان ئـادەمیزادو جنۆكـەو دوایـش پـەرەی سـەندووە بـۆ هاوسـەرێتیان، لـە پەیوەندیەكەشیاندا سـەركەوتوو نـەبوون !!! وە بگـرە هـەندێك گەیشتونەتە ئەوەی كە زەعم بكەن كە هەندێ كەس و بگرە گـەلانێك رۆڵـە ونـەوەی جنۆكە بن و، رەگەزیان جنۆكەیە!!!

لەو هۆكارانەی كە ئەو جۆرە تێڕوانینەیان دروسـت كـرد، ئـەو توشبوونەی موسـولمانان بـوو لـە رووداوە دڵ تـەزێن و كارەسـاتە جـەرگ بڕەكـان، وەك ئـەو قەسابخانانەی كە مەغۆل و تەتارەكان دروستیان كردو ئەو تـرس و چەواشـەكردنەی لـە وڵاتی موسولمانان بلاویان كردەوە كە بە جـارێك تـرس و تۆقـاندن بـاڵی بەسـەر ژیـانی رۆژانەیانیدا داگرتبوو، بۆیە پەنایان دەبردە بەر هەر شتێك كـە بۆنـی ئـارام بەخشـی و حەوانەوەی دەروونی تیابێت.

هەروەها جەنگەكان، گێژاوەكانی نـاوخۆیی، كـە موسـولمانانی پارچـە پارچـە كرد، كە زۆربەیان دڵنارامی و ئاستە دەروونیەكەیان لە دەست دا. وە پەنایان بردە بـەر جیهانێكی خەیاڵی، یان هۆكارێك بۆ پێش بینی كردنـی دوارۆژی بەختـەوەریان، وەیـان كەوتنە جەنگ لەگەڵ شەیتانەكانی جنۆكەو وازیان هێنـا لـە شـەیتانەكان لـە جنسـی خۆیان، كە بە هەموو شێوەیەك هەوڵی بلاوكردنەوەی گەندەڵی دەدەن لەسەر زەویدا.

خۆ ئەگەر بهاتایەو یەكسەر پەنایان بۆ قورئان بردایە، بێگومـان بەسـیانبوو بـۆ دامەزراندن و سەقامگیركردنی دڵنیایی و دڵ ئارامی و ئاسایش لە دڵەكانیاندا، وە ئەگـەر كاریشیان بە فەرمانـەكانی قورئـان بكردایـە، ئـەوا هـەرگیزاو هـەرگیز هیـچ بوارێـك

ڕێگایەك لەبەردەم ملهوڕاندا نەدەما لە کاولکردنی وڵاتو وەلاوەنانی حوکمەکەیانو کوشتنی پیاوەکانیانو دەست بەسەراگرتنی سامان و سەربەرزی و عیزەتیان.

هەمان شت لە سەردەمی شێخی ئیسلام ئبن تەیمیەو قوتابیەکانی ئبن القیم الجوزیدا (رەحمەتی خوایان لێ بێت)، کە بەهەردوویانەوە هەوڵو تەقەلایەکی زۆریان دا بۆ نۆژەن کردنەوەو جیهاد، بەتایبەتیش ئبن تەیمیە چووە ناو گۆرەپانی ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەلاتی سستیو بێ ئومێدی، و خەرافاتو لاسایی کردنەوە، کە بەسیمایەکی جۆراو جۆر خۆی نواندبوو، ڕووبەرێکی زۆری لە بیرو بۆچوونی خەڵك داگیرکردبوو، لەگەڵ ئاڵۆزی وچرِی ناوەڕۆکەکانیان، ئەو دەرفەتەی بۆ نەرەخسا بوو کە بچێتە بنج و بنەوانی گشت بابەتەکان و وردە پێکهێنەرەکانی بابەتیو، پێوانیان بە پێوەرێکی قورئانی وورد، چونکە چۆنیەتی ژیان لەسەردەمی نوێکەرەوەدا مەحاڵە، هەندێ بیرو بۆچوون لە بیرو هۆشیدا هەردروست دەبێت، هەروەکو دەڵێن: خوا رەحمەتی خوای لێ بێت، پێغەمبەر نەبووە سروشی بۆ بێت، لەوانەش هەندێ لە هەواڵ و تێڕوانین وفەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، یان ئەوانەی کە لە پچڕاندراوەکانن لە جۆری داڕشتنو هۆی هاتنیو یان گۆڕانکاری تیاکردنی وەك دانانی وشەیەك لە شوێن وشەیەکی تر بە نیازی ئیجتهاد یان لەبیرکردنی ووشە رەسەنو بنەڕەتیەکەی، ئەوەش زیاتر دەربارەی بابەتی ژنهێنانی ئینسو جنۆکەیە لە یەکتری، وە یان دەرهێنانی جنۆکە لە جەستەی مرۆڤ، ئەویش هەندێ لەو ریوایەتانەی لە ئیمام ئەحمەدەوە پێی گەیشتووە ... هەر بۆیەش هەندێ کەس بە دڵنیاییەوە، لەبەر پلەو پایە بەرزو وردەکاریەکانی ئبن تیمیە و زۆری شارەزایی، ئەو ریوایەتانەیان کردە ئوسولێك بۆ مامەلەکردن لەگەڵ شەیتانو حزبەکەیدا، کە قورئانی پیرۆز باسی لێوەکردووەو سوننەتی دروستی پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) ڕوونیانی کردۆتەوە.

لەم سەردەمەی ئێمەشدا هەمان شێوەی مامەلەکردنی ماددیو مەعنەوی لەگەڵ جنۆکە زیندووکراوەتەوە، لەبەر چەند هۆو مەبەستێك کە ئاماژە بە هەندێکیان

دەکەین. سەرهەڵدانی حاڵەتێکی هاوشێوەی نزیك لە داگیرکردنەکەی خاچ پەرستان لە هەڵمەتی یەکەمیاندا. ئەویش لە هەڵمەتی دووەمی خاچ پەرستانن کە وڵاتانی موسوڵمانی لە ئاکامدا پارچە پارچە کران، دوای رووخانی دەوڵەتی عوسمانی بە هۆکاری دەرەکی، کە خۆیان لە پلانەکانی جوولەکەو هاوپەیمانانیان لە خاچ پەرستانی ئەورووپی عەلمانیەکان، وە هۆکاری ناوەکی کە لێرەدا ناتوانرێت باسی لێوە بکرێت‌و، چەند هەڵەیەك ئەنجام درا کە دەستی لە پێش خستنی ئەو رووخاندنەیاندا هەبوو، لە ئاکامدا کاریگەری داهێنان کەم بووەو لاسایی کردنەوە زاڵ بوو، ومەرجەکانی پێشکەوتنی زانستی لەبەر دەستدا نەبوون.

موسوڵمانانیش هەر تەنها ئەوەیان پێ‌دەکرا کە لە بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی رۆژئاواو شۆرینەوەی پاشماوەی سەربازی و سیاسیەکان دابن، وکاریگەرە کوشندەکەش هەر دیاربوو لەبەردەم هەر پێشکەوتنێکدا، (بلاد و عباد)یش دووچارو گرفتاری چەند فەرمانڕەوایەك بونەوە کە پارێزکاریان لەو ئاستەدا نەبوو وخۆیان نەپاراست لە سیاسەتەکەیاندا، ورواڵەتی تیرۆرست‌و گێژەنەو گیروگرفتی ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و رەوشتی هاتنەکایەوە.

بەم شێوەیە خەڵکانێك پەنایان بردە بەر جیهانی ئەفسانەیی‌و خورافی، یان جیهانی جنۆکە بۆ وەدەست هێنانی چارەسەرو رزگاربوون لەو حالەتە چەوسێنەرەوەو، گیروگرفتە سۆزدار، و دەروونی، و رەوشتی، و کۆمەلایەتی و جنسیەکان ... ئەمەش تەنها هەر بە هۆی لاوازی باوەڕیانەوە بوو بە خواو رۆژی دوایی، و گەلاڵەبوونی کارەساتەکان، وخەڵکانێکی بێ‌کار و تەلەکچی ئەو بارەیان قۆستەوەو شێخایەتی خۆیان راگەیاندو وا خۆیان نیشانی خەڵکی‌دا کە شتی لە رادەبەدەر ئەنجام دەدەن‌و جنۆکە لەبەردەستیاندا کاردەکەن و راستەوخۆ قسەیان لەگەڵدا دەکەن و زانیاریان لێوەردەگرن‌و چارەنووسیان لە خوێندنەوەی ئەستێرەکانەوە دیاری دەکەن!!! بەرادەیەك چەند کەسانێکی خاوەن زانست کە بەواتای (تقوی) ناسرابوون، چوونە ناو ئەو بازنەیە

بۆ دەرکردنی جنۆکە بە ڕێگای قسە لەگەڵ کردنی ڕاستەوخۆ یان بە لێدانو کوتان، ڕۆژبەڕۆژیش خەڵکی زیاتر ڕوویان دەکردە ئەو جۆرە کارانە، لە کاتێکدا قورئان هاتوە بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵك، پێویست بە تێگەیشتن، و لێکدانەوە، وکارکردنە لە پێناو دامەزراندنی بڕوایەکی ڕاست، و پارێزکاریەکی بتەو، و پاککردنەوەی دەروون، وزانینی ئەحکامەکانی شەریعەت وپەیوەست بوون بە سنوورەکانی خوا دەکات، و ئەو جۆرە خوێندنەوەیە مەبەستەکان نایەننە دی و لێیان تێ ناگەین.

بەڵێ قورئانی پیرۆز هەر هەمووی (بەرەکە)تە، بەڵام زیاتر بەرەکەتەکەی بەستراوەتەوە بە لێکدانەوەی ئایەتەکانی، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (كِتَابٌ أنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الأَلْبَابِ) (ص / ٢٩)

لێرەدا نەبوونی کاکڵەی هۆش (لُب)و ڕێك وپێك نەکردنی فاکتەرەکانی تێگەیشتن، بە شێوەیەکی لێ ووردبوونەوە، حاڵەتی تێپەڕبوونێکی رووکەش وبیستن بەسەر ئایەتەکاندا دروست دەکات لە بری بەکارهێنانی هەستو هۆشیاری، کە ئەویش کاریگەریەکی ئەوتۆی نابێت وەك پێویست.

هەروەها ئەوەی پێویستە بەراشکاوی ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە، کاروبەرنامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ خۆپاراستن (اعاذە)ی خەڵك لە شەیتان، بەدەرکردن ودەرهێنانی ماددی نەبوە لە بەدەنی مرۆڤ، بەڵکو بەو ئایەتە قورئانیانەی کە سیماو روخسارە شەرانگێزەکانی شەیتان دیاری دەکەنو، چۆنیەتی خۆ لێ پاراستنی بە ئیمانو، پارێزکاریو کردەوەی چاكو، جیهادکردن لە پێناوی خواداو، پاککردنەوەی دەروون لە ئارەزوو و داوێن پیسی،و گومانو دوو دڵیو ئەو گوناهانەی کە ئەکتیڤی سەرەکین بۆ ئەوەی کە شەیتان بتوانێت بچێتە ناو جیهانی باتنی مرۆڤی، وە ئەگەر بێتو دوورکردنەوەی شەیتان لە مرۆڤ بەو دانیشتنانەو بەو جۆرە بوایە، لەوا پێویستی نەدەکرد کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (٢٣) ساڵ لە بانگخوازیو هەوڵدانو دەردو مەینەتی نەدەبردەسەر بۆ بنیاتنانی پیاوانو ئافرەتانی باوەڕدارو

راستگۆ، لەوا ئەویش (صلی الله علیه وسلم) هەر تەنــها ئـەو جـۆرە دانیشـتنانەی بـۆ ئەنجام دەدان و سەرسەلامەت دەبوو دوژمن زوو لەبەین دەچوو!.

لەهەمووش سەیرتر ئەوەیە، واباسی جنۆکە دەکرێت کە پەیوەندیان پێوەکراوە دەربارەی زانیاری پەیداکردن و هەواڵناســی کـە گوایـە، ژمارەیـەکی زۆری جنۆکـەی جوولەکـەو دیـان (گـاور) و بـووزی هاتونەتـە بـەرەکانی جـەنگ و لـەگـەڵ جنۆکــە موسوڵمانەکان دەجەنگێن، و بەرپابوونی جەنگێکی دژوار لەنێوانیاندا بەرپابوو بەهەزاران کوژراو لە هەردوو لادا کەوتونەتە بەرەکانی جەنگ!!! وە هەروەها بەشداری کردنــی جنۆکـە خوانەناسـەکان لــە جـەنگدا دژی ئـادەمیزادە موســـوڵمانەکان!!! بــەلام بــۆ رۆژنامەنووس و وێنەگرەکان تا ئێستا نەیان توانیوە رێپۆرتـاژی تـەواوی زەرەر و زیـانی هەردوو لا دیاری بکەن؟!! ... ئەی نــاڵێن چاوپێکـەوتنی رۆژنامەگـەریمان لەگـەڵیاندا ئەنجام داون؟

## دۆسییەی جنۆکە یان زنجیرەیەکی تۆقاندن؟

دۆسییە و بوونی جنۆکە هـەروەکو لــە راگـەیاندندا بـەرچاو دەکـەوێت، لــە قەبارەی خۆی گەورەترکراوەو ترس و تۆقاندنێکی زۆر کەوتۆتە دڵی زۆران لـــە پیـاو و ئافرەتان، بە هۆی لاوازی باوەڕ، ونەزانین وترس بڵاوکردنەوەی راگـەیاندن بەڕادەیـەك مامەڵـە کـردن لەگـەڵ جنۆکـــەدا، وەك جـــۆرە پەرســـتنەکەی بـــەر لـــە ئیســـلام وئەفسانەییەکانی لێهاتووە. باوەڕ هێنان بە بوونی فریشتە بەو شێوەیەی کە لە قورئـانو سونەتدا هاتووە، بنچینەیەکە لە بنچینەکانی باوەڕ، زۆریش باسکراوەو روونکراوەتەوە، دەربارەی ئەرکەکانیان لـــە پاراســتنی مـرۆڤ وراپـەڕاندنی ئیش و کارەکانیـان، و پـێ راگەیاندن ودڵنارامی بەسەر دڵی بـاوەڕداران، جـەنگ لـەپاڵکردن دژی خواندناسـان هەروەك لە جەنگی ((بدر و حنین))دا و گشت لایەنە جیهادیەکان کە دەکـرێ دیسـان

دووباره بینەوه هەروەکو خوای بالادەست دەفەرمویت: ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلا مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ﴾ (رعد/۱۱)

هەروەها (جل جلالە) دەفەرمویت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ * نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ﴾(فصلت/ ۳۰-۳۱)

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکیدا دەفەرمویت: ((ان الله تبارك وتعالى اذا احب عبداً نادى جبريل ان الله قد احب فلاناً فاحبه، فيحبه جبريل، ثم ينادي جبريل في السماء: أن الله قد احب فلاناً فاحبوه فيحبه أهل السماء، ويوضع له القبول في الأرض))[51].

واتە: ئەگەر خوای گەورە (جل جلالە) بەندەیەکی خۆشویست جوبریل بانگ دەکات و پێی رادەگەیەنێ کە خوا فلانەکەسی خۆش ویستووە و تۆش خۆشت بوێ، وجبريليش خۆشی دەوێت، ئینجا جوبریل لە ئاسماندا بانگ دەکات و دەڵێ: خوا فلانەکەسی خۆش دەوێت و ئێوەش خۆشتان بوێت، خەڵکی ئاسمانیش خۆشیان دەوێت و هەرئەو خۆشویستنە لەسەر زەویشدا وەلام دەدرێتەوە بە قەبوول بوونیان لەسەر خۆش ویستنی ئەو کەسە وخۆشیان دەوێت.

هەستی لەگەڵدابوونی فریشتە لای هەندێ کەس گۆڕاوە، بە تیۆری ئاگاداربوون و خۆپاراستن لە جنۆکەو ترسان لەوەی نەبادا جنۆکە بچێتە ناو جەستەیان و بەکارهێنانی ئەو هۆکارانەی کە چوونە ژوورەوە قەدەغەدەکەن و هێنانە دەرەوەی لە کاتی لادانی ئەو کۆسپانەی کە دانراون لەبەر دەمیدا، بەبەکارهێنانی بۆن و داخستن و گرتنی کون و قوژبنەکانی خانوو، وئەوانەی لە جەستەی مرۆڤدا هەن، پەنابردنە بەر

لێدان و ئازاردانی جەستەی بە جنۆکە بووەکە، وچاوپێکەوتنی ڕۆژنامەگەری لەگەڵ جنۆکەدا. و وەرگرتنی نامەو زانیاری مێژوویی و ڕووداوەکان لە جنۆکە.

دوایش هەوڵدان بۆ جیاکردنەوەی درۆزن لە ڕاستگۆ، و ناردنی جنۆکە بە ئەرکی سیخوڕیو کاری ئاشکراکردنی دزیەکان و زانینی هۆیەکانی تاوانو ڕووداوە دڵتەزێنەکانو دیاری کردنی شوێن وحاڵی ون بووەکان، وبەکارهێنانیان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان وگۆڕینی هەستەکان وئارام کردنەوەی دۆخی دڵەکان، وە بەکارهێنانی چەند دەستەواژەیەکی شێواوو لێ تێ نەگەیشتن، وهێما وژمارە وپیت، لە کارە جادو کەریەکانیاندا.

## خوای پەروەردگار
## هەر خۆی ئەم بوونەوەرە بەڕێوەدەبات.

هەڵبەتە باوەڕدار بەو پەڕی دڵنیایەوە دەزانێو باوەڕی وایە کە خوای گەورە، هەر خۆیەتی کە کاری بەڕێوەبردنی ئەم بوونەوەرە بە دەستەو بەڕێکی بەڕێوەی دەبات وهیچ هاوبەشیشی نیە، وخوایەکی تریش نیە کە خەڵکان پەنای بۆ بەرن لە بەدەست هێنانی فەڕ یان لادانی شەڕ، هەروەها گیانی شەڕاویش نیە کە، خەڵکی هەناسە سواربکات وچارەنووسیان دیاری بکات، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَاللَّهُ يَحْكُمُ لا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ (رعد / ٤١).

هەروەها هیچ هێزێکی زۆرانبازو سەربەخۆ نیە کە کاربکات بەبێ ویستی خوای گەورە کە ساحرەکان گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن یان هەڵیقۆزنەوە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، و گشت دروستکراوەکان، لەسەر شێوازێکی دیاریکراوی تایبەتی دروست کراون ولە بازنەیەکی دیاریکراودا کاردەکەنو، بۆیان نیە کە لێی

دەربچن بە ویست وئارەزووی کەسێك یان تەلەسمی ساحیرو جادوکەر و فاڵچیەکی مەکرباز، هەر وەکو خوای بالاّدەست دەفەرموێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ جَاعِلِ الْمَلآئِكَةِ رُسُلا أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (فاطر /١).

لە قورئانی پیرۆزدا جۆرە دروستکراوێکمان بەرچاو دەکەوێت کە خۆی تەرخان کردووە بۆ گومرایی کردنی خەڵك، ئەویش (ابلیس)ە یان، (شەیتان)و وجاغ وحزبەکەیەتی، کە رۆژێ لە رۆژان زۆر لە خواوە نزیك بووە، بەلاّم دەرچوو لە ژێر فەرمانی خوای گەورە، ئەو (ابلیس)ەش لە (جنۆکە)یە، جۆرە جنسێکە لە لایەن خەڵکەوە نەبینراوە[(جن) مانای پەردەپۆشی دەگەیەنێ (الاستتار)]، و هۆی سەرپێچیو دەرچوونی لە ژێر فەرمانی خوای گەورە، لە خۆبایی بوون وخۆبە زل زانین بوو، کە رازی نەبوو بە بەجێ هێنانی فەرمانی خوا لە رێزگرتن لە ئادەم و کڕنوش بۆ بردنی ... (وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلا إِبْلِيسَ كَانَ مِنْ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلاً) (کهف / ٥٠).
هەروەها : (قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَنْ تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنْ الصَّاغِرِينَ) (الأعراف / ١٣).

ئەو (شەیتان)ە، مۆڵەتی دراوەتێ بەهەڵسان بەکاری فریودان وگومرایی کردنی خەڵك ولەرێگا راستەکە، لایان بدات، ولەگشت لایەکەوە بۆ قوربانیەکانی دێت، تاوایان لێ بکات کە سوپاس گوزاری خوای گەورە نەبن و نەیپەرستن. خوای گەورە لەو پلەو پایە وجێگایەی کە تیایدابوو دەری کردو بەرەو زەوی رەوانەی کرد بۆ ئەوەی کاری گومرایی کردنەکانی تیا ئەنجام بدات لەنێو نەوەی ئادەمدا. خوای گەورە بەڵێنی ئاگرو دۆزەخی بە ئەو شوێن کەوتوانەیشی داوە لە جنۆکە و ئادەمیزاد (قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَدْحُورًا لَمَنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْكُمْ أَجْمَعِينَ) (الأعراف /١٨)

یەکەم کاری گومراییش لەگەڵ ئادەم و ژنەکەیدا دەستی پێ کرد لە بەهەشتدا بە، (وەسوەسە) نەك بە چوونە ناو جەستەیان ویان برینی ریگا لەیەکێ لە پەنجەرە هەستدارەکانەوە. بەڵکو بەشارەزایی وزانیاریی لە خاڵە لاوازەکانی ئادەمیزاد کە لە خۆشەویستی پاك وخاوێنی وشکۆداری، وپەیداکردنی هێزی شاراوەو رزگار بوون لە کۆتی جەستەو نەمریو مانەوەو، دەربازبوون لە مردنو بەدەست هێنانی سەروەتو سامان، خۆیان دەگرنەوەو دەنوێنن، دەستی کرد بە هەوڵ وتەقەلا بۆ رازی کردنی ئەو دوو هاوسەرە بەختەوەرە بە خواردنی ئەو درەختەی کە خوای گەورە قەدەغەی کردبوون لە خواردنی، بۆ ئەوەی هەریەکە لەو دووانە گرفتار بکات وتاقیان بکاتەوە کە رادەی مل کەچیان بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورە چەندە، وەك تاقیکردنەوەیەکی سەرەتایی.

(ویاآدم اسکن أنت وزو جك الجنة فکلا من حیث شئتما ولا تقربا هذه الشجرة فتکونا من الظالمین * فوسوس لهما الشیطان لیبدي لهما ما ووري عنهما من سوآتهما وقال ما نهاکما ربکما عن هذه الشجرة إلا أن تکونا ملکین أو تکونا من الخالدین) (الأعراف / ١٩-٢٠).

لیرەدا ئەو (شەیتان)ە، بەڵینی بەهەردووکیان دا کە ببن بە دوو فریشتەی نەمر، کە تەنها بە خواردنی ئەو درەختە قەدەغە لێ کراوە، نەمری بە دەست دێنن وهەرگیز نامرن. هەروەك شەیتانە سیحر بازەکان بەڵێن بە خەڵك دەدەن وبە دەست کەوتنی، هێزێکی رادە بەدەرو راپەڕاندنی کارە ئەستەمەکان ئەگەر بێتو روەکێکی قەلابەندیان خوارد وەك (کاشیرا) هەروەك لە یەکێ لە فلیمە کارتۆنیەکان پەخش دەکرێت. فەرمانیان پێ دەکەن بە ئەنجامدانی چەند رێ ورەسمێکی سەمەرەو چەند کردارێکی مناڵانە وپەسەپسەکردنی بە چەند وتەیەکی نەزانراو و مانا بزرو لەرزۆك ...

بەڵام مەبەستی شەیتان لەو سیحرەیدا جگە لە رووت کردنەوەی ئەو دوو هاوسەرە لە جل و بەرگیان شتێکی تر نەبوو، بۆ ئەوەی لەش ولاریان (عورة)یان دەرکەوێت،

هەروەکو شەیتانەکانی ئەمڕۆ ئەنجامی دەدەن لـە نووسـەرو بـەناو ئـەدیب و، ئەوانـەی بانگێشەی بەرەلایی دەکەن و هانی خەڵك دەدەن بـەرەو فـڕێ دانـی بـالاپۆش بـەناوی سەربەستی و پێشکەوتن ئەوەش لـە وتەکـەیدا (جـل جلالـە) دیـارە کـە دەفـەرموێت: ((لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِنْ سَوْآتِهِمَا)).

وە هەروەکو کاری فاڵچی و جادوکەرو سـیحربازەکان سـوێند خواردنـە، بـۆ داپۆشینی درۆو ئەلەسەکانیان، (ابلیس)یش سوێندی بۆ ئەو دوو هاوسـەرە خـوارد کـە ئەو ئامۆژگاریان دەکات وبەرژەوەندی ئەوانی گەرەکەو هەوڵی بەرزکردنەوەی ئاسـتی ژیان وبەختەوەرییانە. ﴿فَدَلاهُمَا بِغُرُور فَلَمَّا ذَاقَا الشَّـجَرَةَ بَـدَتْ لَـهُمَا سَـوْآتُهُمَا وَطَفِقَـا يَخصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ انْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُلْ لَكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾ (الأعراف / ٢٢).

پاشان بۆ ئەو دوو هاوسـەرە روون بووەوە کـە شـەیتان نـاتوانێت بەڵێنەکـەی خۆی بهێنێتە دی و فێڵی لێدەکردن و لەخشتەی دەبردن بە داواو وتە هەنگوینیانەکەی و توانا لـە رادە بە دەرەکەی کە باسـی لێـوە دەکـرد لـە زانینـی نهێنی‌یـەکانی غـەیب و لەوانەش، نهێنی ئەو درەختە.

بەڵام شتەکە پێچەوانە هەڵگەڕایەوە، چونکە دوو هاوسەرەکە هـەنگاوێك بـۆ دواوە گەڕانەوە، بە شوێن کەوتنیان لـە هـەنگاوێکی شـەیتان، و یـاری پـێ‌کردنی ئـەو مەخلوقە فێڵبازە ئاشکرابوو، و ئەو دوو هاوسـەرە هەوڵیاندا لەش و لاریان داپۆشـن بـە چنراوێك لـە گەڵای درەخت. ئینجا گوێیان لە بانگی خوای گـەورە بـوو کـە گلـەیی لێ‌کردن بە پەیوەست نەبوونیان بە ڕێنمایی خوا لەو فەرمانەدا، و ئاگـادار کردنـەوەیان لەشەیتان و دوژمنکاریەکەی و لە خشتە چوونیان بـە بەڵێنـەکانی شـەیتان، بـەڵام دوای ئەوەی کە کات بەسەر چوو، لەو کاتانەدا بەوپەڕی مل کەچی‌یەوە روویانکردە خـوای گەورەو وتیان: ﴿قَالا رَبَّنَا ظَلَمْنَا انفُسَنَا وَإنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنْ الْخَاسِـرِينَ﴾ (الأعراف / ٢٣).

به تەواوی گەیشتە لەو دڵنیاییەی کە بڕواکردن بە بەڵێنەکانی شەیتانی جنۆکە شتێکی خەیاڵیو ستەم کردنە لە خۆ، وە زانیان کە تاوانیان لەئەنجام داوەو دەبێ داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەنو دووبارەی نەکەنەوە، بەڵکو بە بەر میهرەبانیەتیو رەحمەتی خوای میهرەبان بکەون.

بێگومان بەردەوام بوون لە شوێن کەوتنی بانگێشتەکانی شەیتانو هەڵ خەڵەتان، بە پەیمانو بەڵێنەکانی، مرۆڤ دووچاری زیانێکی گومان لێنەکراو دەکات لە دونیاو لە رۆژی دوایدا... ﴿قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ (الأعراف / ٢٤).

بەم جۆرە ئەو دوو هاوسەرە دابەزینە سەرزەویو هەڵبەتە ئەو (ابلیس)ەشیان لەگەڵدایە، بۆ ئەوەی جەنگەکە هەر بەردەوام بێت لە نێوان ئەو و نەوەکانی لەو ژن و مێردە، (ئادەم و حەوا)، وتائێستاش هەر بەردەوامە و هەر بەردەوامیش دەبێت لە هەڵرشتنی بەڵێنە درۆیەکانی ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمْ الشَّيْطَانُ إِلا غُرُورًا﴾ (النساء / ١٢٠)... لەو شەیتانە هەڵدەستێ بە کرداری گومڕاکردن، نەخشەدانانی خۆزگەو ئاواتی لە گونجاو و نەشیاو بۆ خەڵكو گۆڕینی لەو شتانەی کە خوا دروستی کردوونو، داماڵینی خەڵك لە جل و بەرگیان، فەرمان کردن بە خراپەو داوێن پیسی، هەڵبەستنی ووتەیەك کە خوای گەورە نەی فەرموێت، رە پێش کردنی خەڵك بۆ ناو ئاگری دۆزەخو پەرشو پەخش کردنی چەند کاروبارێکی نارەواو نادروست لە بۆشایی گەریدا بە مەبەستی تێکەڵ کردنی ئایەتەکانی خوای گەورە لەگەڵ لەو هەوا پێدانانەی شەیتان بۆ خەڵك، تەنها بە وەسوەسە.

## شەیتان بێبەشکراوە
## لەوەی کە دەسەڵاتی هەبێت بەسەرباوەڕدارا

هەوڵەکانی شەیتان لە گومڕاکردنی خەڵکدا لە چەند شێوەیەکدا خۆیان دەنوێنن، کە لە قورئاندا باسیان لێوەکراوە، لەوانە چوونە بەین، و نەنگ گرتن، و وەسوەسە، ومەس ولەبن گوێ خوێندن، وفیتنە، وبۆڕازاندنەوە، کە بە هیچ جۆرێك ئەو جۆرە شتانە کار لە باوەڕداران ناکەن ولەئەرك و رۆلەسەرەکیەکانیان دووریان ناکەنەوە، سستی ناکەن لە خوا پەستنەکانیاندا، چونکە ئەو جۆرە باوەڕدارانە خۆیان بە خوا دەپارێزن، هەمیشە لەذیکرو فکری ئەو دان جل جلالە، بەر لەوانەش باوەڕو پشت بەستنیان بە خواو خۆ ئامادەکردنیان بۆ دوژمنایەتی کردن لەگەڵ شەیتان وحزب ولایەنگرانو نەوەکانیاندا کاری رۆژانە وهەمیشەییانە.

هەروەها (ابلیس) و دەستو پێوەندەکانی هیچ دەسەلاتێکی بەزێنەریان نیە بەسەر باوەڕداران، کە بتوانن بیروهۆشەکانیان بروخێنن، و ئاسایشیان لێ زەوت بکەنو ئازاریان بدەن لە ناخو پەیوەندیو ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیاندا، هیچ کاریگەریەکیان نیە لە ئاراستەکردنی هێزی سەربازی لە دژیاندا. بەڵگەشمان بە دەستەوەیە کە خوای گەورە
دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ ﴾ (سبأ / ٢٠).

ئایەتەکە ڕوونە، لەوەی کە ئیبلیس چەند کەسانێکی هەڵبژاردووە پاش ئەوەی کە دڵنیا بوو لەوەی ئامادەیی وەڵامدانەوەی بانگێشەکەیان تیایە، ئەویش بە هۆی کوفریانەوە، و دەست نیشانکردنو دڵنیایەکەشی راست دەرچووە لە جێی خۆی بوو، کە شوێنی کەوتن، بەڵام ئەوانەی باوەڕداربوون ((إلا فَرِيقًا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ)) ئەو گروپەی باوەڕداران ئەو ئامادەیی و ئەو زەمینەیان نەبوو کە شەیتان بتوانێ لەسەریدابنیشێ.

کەواتە شەیتان، ئەو دەسەلاتەی نیە (زانیاری (بەڵگــە) + هـێز)، کــە مـرۆڤ چۆك دا بـدات بـۆ پـەیامو فەرمانـەکانی، بـەڵکو فاکتەرێکـە، یـان ئـامێرێکی دەسـت نیشانکردنو جیاکردنەوەیە بۆ ئەوەی بەهۆیەوە لــەو کەســەی بـاوەڕی هەیـە بـەرۆژی دوایی جیابکرێتەوەو ووردەکاریو چۆنیەتی جیـهانی ئبلیــس، لـە قورئـان (سـروش) و سونەت وەردەگرێتو، پلەو پایەیـەکی بـەرزی پـڕ لـەشـانو شـکۆداریو لێ ترسـان، نادات بە ئبلیس، چونکە ئەو باوەڕداره دەزانێت کە (إنَّ كَيْـدَ الشَّـيْطَانِ كَـانَ ضَعِيفَـاً) (نساء/ ٧٦) مەگەر ئەو کەسانە نــەبن کـە گومانیـان هەیـە لــە ڕۆژی دوایـیو ئـەو غەیبەی کە بە ئاخیرەتەوە پەیوەندیدارە،ئەمەشـیان هـەر زوو خـۆ دەدات بـە دەسـتەوە لەبەردەم فڕوفێڵەکانی شەیتانو ترسـاندنو گومانـە ئیبلیسـیەکانو هـەروەها، خـوای گەورە باڵادەستە بەسەر گشت شتەکانەوەو لە توانای هیچ کەسێك یان هێزێك دا نیە، کە کاربکەنە سەر مرۆڤ بە چاکە یان بە خراپە، بێ مۆڵەت دانو ڕازی بوونی خـوای باڵادەست.

## شەیتان ئاهەنگی گۆرانی دەگێڕێت
## جەنگ بەرپادەکات و نەخۆشیەکان دروست دەکات

دەربارەی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاسْتَفْزِزْ مَنْ اسْـتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَاجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِـي الأَمْـوَالِ وَالأَوْلادِ وَعِدْهُـمْ وَمَا يَعِدُهُمْ الشَّيْطَانُ إِلا غُرُورًا) (الأسراء / ٦٤)

بەم مانایە، شەیتان دەنگی تایبەتی خۆی بەکاردەهێنێت کە بریتی‌یە لە (وەسوەســە) کــە دەنگێکی شاراوەیەن یان ئەو دەنگە گوناهکارانەی مرۆڤن، جا چ ئەو دەنگانــە بـن کــە بانگێشەی جەنگە جاهیلیەتەکان دەکەن لە ژێر سەرکردایەتی شـەیتان بـۆ سەرخسـتنی ناهەق، یان ئەو دەنگانە بن کە بانگێشەی گومڕایی دەکــەن کــە لــە دەمــی خەڵکــەوە

دەردەچن وەیان ئەو دەنگانەی، گۆرانیەکان بن کە دەبنە مایەی بلاوبوونـــەوەی داوێـن پیسی، هەر کامەیان بێت ئەو دەنگانــە روخســارێکی شــەیتانیان پێوەیــەو خــەڵك فریـو دەدەن بۆ ئەوەی بکەونە ناو تــۆڕی گونــاهو تــاوانو کوشــتارێکی ســتەمکارانە ولاّغ‌و پیاوانیش سوورتەمەنی جەنگی شەیتانو شــوێن کــەوتوەکانن؛ دژ بــە خــەڵکی هــەقوەر، دەربارەی بەشداری کردنی لە ســامانو منــاڵی، ئەوەیەکــە پــارە تــەرخان بکرێـت بـۆ خوایەکی درۆی‌و قەڵپی دروست کراو، و لەخۆگرتنی قوربانی بۆ ئەو جۆرە خوایانــەو حەرام کردنی چەند توێژو چینێـك‌و ئــەوەش بەپێشــکەش کردنــی قوربــانی مـرۆڤ بـۆ خواکان، هەروەها گشت قازانجە حەرامەکان دەگرێتــەوەو یــان بــەکارهێنانی لــە پێنــاو مەبەستێکی حەرام کراودا ... بەڵێنەکانی شەیتانیش هەر ئەو جۆرە بەڵێنانــەن کــە وای دەرازێنێتەوە گوایە رزگاری دەبێت لە سزا، لەسەر ئەو گوناهانەی کە ئەنجامی داون بە جۆرەهــا لێــك دانــەوەو بۆچوونــی دیــاریکراوی چــەند ئایــەتێکی خــوا، یــان پارچـــە پارچەکردنی ئایەتێك کەسەرەتای ئایەتەکە لەوانی تـر دابپچڕێـنرێت، یــان بەشــێك لــە ناوەڕاستی ئایەتێك وەربگیرێت، وبەم جۆرە کە لەگەڵ بابەتەکەی ئەودا بگونجێت، ئــەم جۆرە بەش بەش کردنەی ئایەتەکان گەورەترین ستەمە کە لە قورئانی پیرۆز دەکرێت.

هەروەها بەڵێندان بە خەڵکی نا زاناو چاوبرسی بە دەوڵەمەندبوون، لە رێگای بە دەست هێنــانی قــازانجی حــەرام، وســەرکەوتن بــە بــەکارهێنانی هۆکــاری حــەرام و ناشەرعی ... بەهەر حاڵ، بەهەر جۆرە فریو دانێك بێــت، یــان بــەڵێن‌و رازاندنەوەیــەك بێت، وە یان بەبەشداری کردن بێت، خــۆ ئــەو نایــەت لــەو جــۆرە بەشــداریکردنانەدا بەشداریەکی بینراوی‌و مەلموسی (ماددی) لەگەڵدا بکات، وەك بڵــێی لەگــەڵ فلانــە ئافرەت خەوتووەو ژن و مێردایەتیان ئەنجام داوە، وەیان ماڵی فلان بدرزێ، تەنانەت ئەو جۆرە بە خەیاڵدا هاتنانەش بە هیچ شێوەیەك کار لە باوەڕداران ناکەن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ وَكَفَى بِرَبِّكَ وَكِيلًا﴾ (الأســراء /٦٥).

بۆیە کاتێ مرۆڤ لە پێداویستیەکانی بەندایەتی بۆ خوا دەکۆڵێتەوەو لە مل کەچیەکەیدا دڵسۆزی دەنوێنێو، هەروەها لە خۆشەویستیو پەیوستنەکانیدا، خوا بە وەکیل دەگرێت لە گشت کاروبارەکانیدا و بە هیچ جۆرێك نە لەشەیتان و نە لە حزبەکەی ناترسێت، بۆیە شەیتان بەدڵێکی پڕ لە غەم و پەژارەوە لەو شوێنە جێ دەهێڵێت [٥٢].

وە هەرچی هەیەو بیسراوە دەربارەی ژن هێنانی جنۆکە لە ئادەمیزادانی- ئافرەت- و هاوسەرایەتیان ئەوا ((ئەو فەرموودانە، هەڵبەستراون، هەواڵەکانیش لە نەناسراوانەوە هاتوون، و رووداوەکەی (اعمش)یش لە کەسێکی نە ناسراو وەرگیراوە، ابو معاویە لە مەسەلەکەدا هەڵەی کردووە، وەیان اعمش شتێ خستۆتە ناو (دلّس)، لەوەی کە ابو معاویە باسی لێوە دەکات، چونکە ابا الازهرو عبدالرحمن بن مغراء چیرۆکەکەیان لە اعمشەوە گێڕاوەتەوە، لە شێخی بجیلەن ئەوەی مالك و قەتادە والحسن والحکم لەو بارەیەوە نەقلیان کردوە راست نیە چونکە اسانیدەکان لاواز و نادیارن (منکرە)))[٥٣]

هەروەها ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَامَعْشَرَ الْجِنِّ قَدْ اسْتَكْثَرْتُمْ مِنْ الْإِنسِ وَقَالَ أَوْلِيَاؤُهُمْ مِنْ الْإِنسِ رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِي أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ (الأنعام / ١٢٨)

ئەو زۆری کردنەی جنۆکە لە ئادەمیزاد مانای وا نیە کە بەشداری کرداری جنسیو جووت بوونی جەستەییان بوو بێت، بەڵکو مانای راکێشانو تووش کردنی مرۆڤە بە هەنگاوەکانی شەیتانو شوێن کەوتوانیو، وەسوەسەی ئبلیس وحزبەکەی. ئەو سوودو چێژ لەیەك وەرگرتنانە (شەیتان لە ئادەمیزاد و ئادەمیزاد لە شەیتان) بەستراوەتەوە بە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ هەنگاوەکانی شەیتان وشوێن کەوتوەکانی، جنۆکە چێژ لە گومڕاییو شوێنکەوتنی بەجێ هێنانی حەزو

ئارەزووەکانیان وەردەگرن، هەروەها ئەو تاوانانەی کە لەزەت و تامی رابواردنی لێ وەردەگرن، بۆیە دەڵێن: ((ربّنا استمتع بعضنا ببعض)).

## دڵە راوکێی ریبابازەکان (مس)ی شەیتانە

کە چی بەڵگەهێنانەوەیان ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لا يَقُومُونَ إِلا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَنْ جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّهِ فَانْتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (البقرة / ٢٧٥)

واتە ئەوانەی کە ریبا وەردەگرن، لە گۆڕەکانیان هەڵناسنەوە، مەگەر وەك ئەو کەسە نەبێت کە تووشی خووگرتن هاتبێت و شەیتان دابێتی لە زەوی بە هۆی بێ عەقڵیەوەی لە زەویدانی جنۆکە شەیتان بۆ ئادەمیزاد، ئەوا هاتنی بەو شێوەیەی کە هەندێ لە مفسرین (رەحمەتی خوایان لێ بێت) بۆ تەفسیری ئەو ئایەتە پشتی خۆیان بەستووە بە، چەند زانیاریەکی پزیشکی مێژوویی دارێژراو، لەسەر گومان بووە.

وە (مسّ) مانای (صرع) ناگەیەنێ، هەروەها مانای شێتیش ناگەیەنێ بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای کاربەجێ دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ﴾ (الأعراف / ٢٠١).

ئەم ئایەتە ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەو کەسانەی کە لە خواترسن و پارێزکاری دەکەن، کە (باوەڕداران) دەگرێتەوە، ژیرن، هۆشیارن، لەوانەیە شەیتان تووشی جۆرە خەتەرەیەکی کردبن کە دەوری لێکدانەوەو هەستەکانیان بگرێت لە کاتی تووڕەبوون یان جوڵانی ئارەزووەکانیان،و وایان لێ دەکات کە پێیەوە گیرۆدەبن و بەپێی ویستی ئەو گیرۆدەیە کاربکەن، ئەگەر یادی خوانەکەنەوەو وابە بیریاندا نەیەتەوە کە ئەو (مسّ)ە لە شەیتانەوەیەو دەتوانێت لە خشتەیان بەرێت و گومڕایان بکات و لەو کاتانەدا دڵەکانیان دەکرێتەوە خوایان دێتەوە یاد. وە ئەوەی راستی بێت،

زۆربەی موفەسیرەکان ووشەی (مسّ)یان بە (وەسوەسە) تەفسیر کردووە، ئەگەر چی (وەسوەسە)ی تەواویش نەبێت بە مانای ووشە، ئەوا حالەتێکی نزیکە لێی و دەچێتە ناو قالبی کردارە شەیتانیەتە جۆر بە جۆرەکانی کە دەگاتە رادەی شێت بوونو لەدەست دانی هۆشیاریو لەکارکەوتنی هەستەکان ... ئایەتێکی دیکەش هاتووە لە قورئاندا کە باس لە (مسّ) دەکات کە خوای گەورە وتەکەی ئەیوب پێغەمبەرمان (علیه السلام) بۆ دەگێڕێتەوە کە دوعاکەش وەڵام درایەوەو راگیرکرا: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ (الأنبياء / ٨٣).

لێرەدا شەیتان، ایوب پێغەمبەری (علیه السلام) ماندووکردو ئەشکەنجەیەکی زۆریدا بەو شتەی کە لەگەڵیدا ئەنجامیدا بوو لە (مس)ێکی بەشی (جزئی)، نەك ماددیکە هۆشو ژیری بەرێت، هەستی زەوت بکات، و لەزەوی بدات هەروەکو چۆن خووگرەکان دەکەونە سەر زەویو دەمیان کەف دەکاتو ددانەکانیان لەیەك دەداتو زمانیان دێتەدەر. هەرگیز ناشێ کە خوای گەورە بەو جۆرە پێغەمبەرەکانی خۆی دووچاری ئەو جۆرە نەخۆشیانە بکات کە سیماو نیگایان بگۆڕێتو لەپایەیان کەم ببێتەوەو لاوازی بکەوێتە ناو رۆڵی هەڵسانیان بە کاری راگەیاندنی پەیام، بەڵکو ئەم جۆرە (مس)ە کێشەیەکی دەروونییە و لە (وەسوەسە) نزیکەو لەوانەیە زیاتریش بێت، ئەویش بە گەورەکردنی میحنەتی نەخۆشییەکەی لە دەروونیدا، و وای لێبکات کە هەستێکی وای لا دروست بکات کە شایانی ئەو هەموو دەردو ئازارو ئەو جۆرە بەلایە نیە! یان ئەو قسانەی کە نزیکانو خزمانی لای ئەو دەیدرکێنن کە کار لە ئارامیەکەی بکەن، وەك ئەوەی بڵێن، ئەگەر خوای گەورە ایوب (علیه السلام) خۆش بویستبایە، ئەوا گرفتاری نەدەکرد بەو جۆرە بەلایانە، و شەیتانیش لە پەنای ئەو وشانەدا ئازار دروست دەکات لە دەروونیدا (علیه السلام) و دووچاری دڵەڕاوکێو ئەشکەنجەی دەکات.

باشترین و پەسندترین لێکدانــەوە بۆ (مــسَّ) لــەو ئایەتــەی کــە بــارو دۆخو چۆنیــەتی ڕیابــازان ڕوون دەکاتــەوە چ لــە ژیــانی دونیایــانداو چ لــە ڕۆژی دوایــدا، ئەوەیەکە، ئەو جۆرە توێژەی خەڵك، هەڵناسنەوە سەر پێ لە ژیانداو ناژیت مەگەر بــە دلە ڕاوکێو هەڵبەزو دابەز نەبێت، بە هۆی هەست کردن بە گوناهو ترسان لە لەبەین چوونی سامانی، یان لە دوارۆژدا ســزا دەدرێــت بــە هەڵســانەوە لەســەر هــەمان ئــەو شێوەیەی کە ژیانی تیا بردۆتەسەر لە دونیادا، لە ڕوانگــەی، سزا لــە جنــسو جــۆری کاروکردارە، وهەرگیز سەقامگیرو ئاسودە نابێ، وەك ئەوەی شەیتان هەڵبــەزو دابــەزی پێبکات، واتە وەك ئەوەی شــەیتان، ئاراستەی بکــات بــەرەو گومڕایــیو نابینــایی، یــان بەرەو ئاراستەیەکی دروستو یەك ڕێ، کەواتە (الخبط)، ڕۆیشــتنە لەســەر گومڕاییو کارکردن لەسەر ناپارســەنگی وەك ڕەفتــارکردنی کوێرانــە، کــە دەســت نیشــانکردنی کارەکانی دیارنەبێتو بەگشت لایەکدا بڕواتو خۆی بدات لەم و لەو لێرەو لــەوێ، بۆیە ئــەو کەســەی دووچــاری (مــس)ی شــەیتانی دەبێتــەوە بەشــێوەیەکی وەرزی یــان جاروبار، بێ یادکردنەوەی خوا،یان تەوبە کردن، هەڵبەتە لەنگــەری بــیرو کــرداری لا وون دەبێتو هەر جارەو ڕایەكو هەر ڕۆژەو ڕەنگێكو ئەم ڕایە بۆ ڕای ئەو وازلێدێنــێ وئەم مەزهەبە بۆ مەزهەبی ئەو.

ئەمەش نزیکە لە فەرمودەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿قُــلْ أَنَدْعُــو مِــنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَنفَعُنَا وَلا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَى أَعْقَابِنَــا بَعْــدَ إِذْ هَدَانَــا اللَّــهُ كَــالَّذِي اسْتَهْوَتْهُ الشَّيَاطِينُ فِي الأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُ أَصْحَابٌ يَدْعُونَهُ إِلَى الْهُدَى ائْتِنَــا قُــلْ إِنَّ هُــدَى اللَّــهِ هُــوَ الْهُدَى وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الأنعام / ٧١).

ئەو دوو دڵیەش لە نێوان ڕێنماییو لەو ئارەزوومەندیە شەیتانیە خاوەنەکەی دووچــاری ئازارو بێ نەوایی دەکات. وە مرۆڤایەتی، هەر هەمووی لە گێژەلــوولی وێڵــیدا دەژیــن ئەگەر بێتو وازیان لە بەرنامەی خوا هێنا یان لایاندا لێی، وە یان بیگۆڕنەوە بە شتێکی تر ... وە بێگومان ئەوەی کە ایوب پێغەمبەر (علیه الســلام) دووچــاری بــوو بەشــێکی

کەمی شەکەتیو ئازاربوو بە (نکرە) هاتووە، کەچی ریاباز و سەرلێ شێواوەکان، ئەوانە بە دەست حاڵەتێکی (مسّ)ی بەردەوامو بارگران دەناڵێنن کە هیچ شتێك شـك نابەن کە لە خۆیانیان دووربکەنەوە یان لەبەرۆکی خۆیانیان بکەنەوە.

## ژێرس دەست کردنی جنۆکە

## لە تایبەتمەندیەکانی سلیمان پێغەمبەرە (علیه السلام)

لەو بەڵگانەی کە بەراشکاوی دەیسەلمێنن کـە ژێـر دەسـت کردنـی جنۆکـە خواپێداوێکی تایبەتی بووە بە سلیمان پێغەمبەر (علیه السـلام)، لـە چوارچێـوەی ئـەو دەسەلاتەی کە پێی درابوو و نادرێت ونـەدراوە بـە کەسـێکی تـر جگـە لـەو (علیـه السلام)، لە پاڵ چەند بەخششـێکی تـر، وەك، ژێـر دەسـت کردنـی بـا و، بـۆ نـەرم کردنەوەی مس، ئەویش بە هەڵقولانی چاڵە ئاگر (برکان)ێکی مسی تواوە لە زەویـدا، یان بە ئیلهام کردنی لە چۆنیەتی تواندنەوەی ئەو کانزایە بەرێگایـەکی جیـا لـەو رێگـا ئاساییانە. هەروەکو خـوای میـهرەبان دەفـەرموێت: ((وَلِسُـلَيْمَانَ الرِّيـحَ غُدُوُّهَـا شَـهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ وَمِنَ الْجِنِّ مَنْ يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِـإِذْنِ رَبِّـهِ وَمَـنْ يَـزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ) (سبأ / ١٢).

ویستی خوای گەورەو کار بەجێ وابوو کە سلێمان پێغەمبەر (علیـه السـلام) تایبەتمەند بکات بە ژێر دەسـت کردنـی گروپێـك لـە جنۆکـە بـۆ کـارکردن لـە ژێـر دەستیداو بەگوێرەی داواکاریەکانیو بەرێگا پێدانو مۆڵەتی خـوای گـەورە، نـەك بـە خۆتێ هەڵکوتانێکی خودی سلێمان پێغەمبەر (علیه السلام) بوبێت بۆ ناو ئەو جیهانـە. ئەو جنۆکانەش بەرخورت (مجبرون) بوۆنە لـە پەیوەسـت بوونیـان لـە ئـەنجامدانی ئـەو کردارانەو بەردەوام بوون لەسەریانو ژێر فەرمان بونیان.

کارەکانیشیان بریتی بووە لـە دروسـت کردنـی پەرسـتگاو پەیکـەرو وێنـەی شێوەکاری هەندێ کەل و پەل و گیان لەبەر، هەڵبەتە ئەمـەش بـەر لـە حـەرام بوونـی

رینەکێشان، وەهەروەها دروست کردنی حەوزو بەربەست بۆ کۆکردنەوەی ئاو، رەنجەڵی گەورە بۆ چێشت تیا لێنان... و هەموو ئەو بەخششانەش پێویست بە سوپاس و سوپاسگوزاریەکی زۆری (آل داود) دەکەن بۆ خوای بەخشندە.

لە فەرموودەی پێغەمبەریشا (صلى الله عليه وسلم)دا هاتووە کە مامەڵەکردن لەگەڵ جنۆکە لە تایبەتمەندیەکانی سلێمان پێغەمبەر بووە (عليه السلام)، بخاری (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە أبو هریرەی گێڕاوەتەوە ئەویش لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە فەرمویەتی: ((إن عفريتاً من الجن كفلّت عليّ البارحة -أو كلمة نحوها- ليقطع عليّ الصلاة مكنني الله تبارك وتعالى منه وأردت وأن أربطه على سارية من سوارى المسجد حتى تصبحوا وتنظروا إليه كلكم، فذكرت قول أخي سليمان (عليه الصلاة والسلام): ربِّ اغفر لي وهب لي ملكاً لا ينبغي لأحدٍ من بعدي))[٥٤].

## داننانی جنۆکە لە بە نەزانینیان لە (غەیب)

لەو بەڵگە قورئانیانەی کە ئەوە ئاشکرا دەکەن، کە جنۆکە هیچ لە (غەیب) نازانن هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَى مَوْتِهِ إِلا دَابَّةُ الأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتْ الْجِنُّ أنْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ﴾ (سبأ / ١٤).

لەو کاتەی کە سلێمان پێغەمبەر (عليه السلام) کۆچی دوایی کرد، جنۆکە بە مردنیان نەزانی و بەبەردەوامی کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدا بە گوێرەی سیستەمی ژێردەستە بوون (تسخير) کە بۆ جنۆکەکان وەك ئازارێکی گران بوو، تا ئەو کاتەی (دابة الأرض) هات، کە دەڵێن (مۆرانە) بووە، ئەویش زۆرکاربووە وەك ئەوانی تر دەستی کرد بە خواردنی گۆچانەکەی کە سلێمان پێغەمبەر (عليه السلام) بۆ

خۆڕاگرتن بەپاوە بەکاری دەهێنا، وە کاتێ دار دەستەکەی داخوراو رزیوکەوتە سەر زەوی‌و گۆچانەکەی لیتر نەیتوانی رای‌گرێ، ئەو کاتە ﴿فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتْ الْجِنُّ انْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ﴾ (سبأ / ١٤)، کەواتە ئەگەر جنۆکە نەتوانن خۆیان لە ئازاری گرانیان رزگاربکەن، چۆن دەتوانن خەڵکی تر رزگار بکەن؟ یەکێك بۆخۆی نەبینێت، بە ئەوانی دیکە چی‌بدا؟

## مەزهەبی روحی
## ئایینێکی تازەو دروست کراوە بۆ روخاندنی ئایینی هەق

لە مەزهەبە نوێیەکانی ترسناك بۆ سەر ئایینی ئیسلام، مەزهەبی روحی‌یە کە ئیدعای ئامادەبوونی گیانەکان (الارواح) دەکات. وئەو مەزهەبەش تازەیەو لە ساڵی ١٨٤٦ لە ئەمەریکا سەری هەڵدا لە نێو خێزانی (فوکس) کە وا گومان دەبات کە، گیانێك سەرەدانی کردووەو لە دەرگای ماڵەکەی داوەو گفتوگۆ لە نێوان ژنی (جون فوکس) و ئەودا سازدراوە، ژنەکە پرسیاری لێ‌کردووە کە لە دەرگایان بدات بە لێدانێکی، گونجاو لەگەڵ پرسیارەکانی‌دا، وەك پرسیارکردن لە تەمەنی کچەکەی‌و ئەویش، بە ژمارەی ساڵانی تەمەنەکەی لە دەرگای داوە. بەڵام رەگی ئەو مەزهەبە هەروەکو بانگخوازانی بۆی دەچن دەگەڕێتەوە بۆ قوڵایی مێژوو، و بۆ ئەو چاوپێکەوتنانەی پێغەمبەران لەگەڵ فریشتەکانداو هەروەها، بۆ فرە خواوەندەکانی گەلانی کۆن کە بەزەعمی ئەوان گیانێکی رێنیشاندەر بوونە.

ئەوانەش توانای گفتوگۆ کردن، لەگەڵ گیانەکان دەگەڕێننەوە بۆ سوقرات کە دەیووت: گیانێك هەیە رێنمایی دەکات، هەروەها بۆ فیساگۆرس کە یەکەم کەس بووە دانیشتنی رۆحی بەستووەو سازی داوە، ئەو مەزهەبە لە رێگای میسرەوە گەیشتۆتە وڵاتانی موسوڵمانان وچەند نووسەرێك شتیان لەسەر نووسیوە، وەك محمد فرید

وجدی کە سەرۆکی دەرکردنی گۆڤاری (الازهر) بووە لە ساڵی ١٩٤٢ کە تویژینەوەی رۆحی تیابلاو دەکردەوە، وشێخ تەنتاوی جاوهەری لە تفسیرەکەیدا بەناوی (الجواهر فی تفسیرا القران) و کتێبی (الارواح) داو، احمد فهمی ابوالخیر یەکەم کەس بووە لە دەزگای (روحی) لە ماڵەکەیدا دامەزراندووەو لە ساڵی ١٩٤٧دا گۆڤاری (عالم الروح)ی دەرکردووە.

ئینجا وورده وورده کۆمەڵە رۆحیەکی زۆر دروست بوون، و د. علی راضي یەکەم کەس بوو کۆمەڵەیەکی رەسمی دروست کرد بەناوی (جمعیة الأهرام الروحیة) لە ساڵی ١٩٧٤ و نزیکەی ٢٠ کتێبی لەو بابەتەوە داناوەو بە چاپی گەیاندووە. هەروەها حەلەقەی رۆحی لە تورکیاو ئەندەنوسیاو کوێت دا دەبەسترێن، هەروەکو لە کتێبی (موقف الإسلام من السحر)دا هاتووە.

وایێدەچێ کە سەرهەڵدانی بیرۆکەی چوونە ژوورەوەی گیانە شەرانیەکان بۆ ناو جەستەی مرۆڤ، دەگەرێتەوە بۆ ئوصولی چەند تەعالیمێك کە لە سەردەمی نوێ (العهد الجدید)دا هەن.

هەروەکو حسان عبدالمنان دەڵێ: لەراستیدا من چەند فەرموودەیەکم تاوتوێ کردووە لە کاتی خۆیدا بە گوێرەی ئەو تەعالیمانە ((و یارمەتی داوەو هاوکاری کردوە لەسەر بلاوبوونەوەی ئەو جۆرە فیکرانەوە بەستنەوەی لە نێوان کتێبی موسولمان (قورئان) و کتێبی دیانەکانو، خاوەن کتێبەکان)) ... وە لە ئینجیلی لۆقادا (٩/٣٧-٣٤) وئینجیلی مەتی (١٧/١٤-٢١) وئینجیلی مرقس (٩/١٤-٢٩)، مرقەس لە قسەکانیدا دەڵێ: ((کاتێ گەیشتن بە قوتابیەکان خەڵکێکی زۆریان بینی لەدەورپشتیانداو هەندێك لە نووسەرەکان دەمەتەقێیان لەگەڵدا دەکردن، هەر کە ئامادەبوان بینیان گشتیان سەرسام بوونو بەپەلە چوون بۆ سەلام لێکردنی. لێی پرسین: دەربارەی چی دەمەتەقێیان لەگەڵدا دەکەن؟ لەناو خەڵکەکە پیاوێك وەلامی دایەوە: ((ئەی مامۆستا، کورێکی خومم بۆ هێناویو گیانێکی لالی تیایە، بۆ هەر کوێ بیبەم

دەیدات بە زەویدا، دەمی کەف دەکات، ددانەکانی لەیەك دەدات‌و وشك هەڵدەگەڕێت. لە قوتابیەکانم داوا کرد کە دەری کەن بەڵام نەیانتوانی)) ئەویش رووی تێکردن‌و وەڵامی دانەوە (ئەی نەوەی کافر تاکەی لەگەڵتان بم؟ تا کەی تەحەمولتان بکەم؟ بۆمنی بێنن، هەر کە گیانەکە بینی‌ی توند دای لە زەوی‌و دەستی کرد بە گەوزان وکەف کردن، لە باوکی پرسی لەکەیەوە وای بەسەر هاتووە؟ ووتی: ((هەر لە منالیەوە، وە زۆربەی جاران دەیبینم لەناو ئاگرە یان لەناو ئاو بۆ ئەوەی لەناوی بەرێت، ئەگەر دەتوانیت شتێکمان بۆ بکەیت، دڵت بۆمان بسووتێ‌و بەهانامان وەرە)) ئینجا یسوع پێ‌ی ووت: ((ئەگەر بتوانیت! باوەڕدار دەتوانێ هەموو شتێك بکات))، باوکی منالەکە لە هەمان کات هاواری کرد ((باوەڕم هێناو باوەڕ لاوازیم بەتین بکە!)) یسوع بینی کە خەڵکی زیاتر کۆدەبنەوە. گیانەکە لێ‌ی بێزار بوو، یەسوع پێ‌ی ووت: ((ئەی گیانی کەڕو لاڵ، من فەرمانت پێ‌دەکەم، لێ‌ی دەرچەو جارێکی تر نەگەڕێتەوە ناو جەستەی، یەکسەر هاواری لێ بەرز بووەوەو بەهێز دای لە زەوی‌و لەجەستەی چووەدەر، منالەکە وەك مردووی لێ‌هات، بەو رادەیەی کە زۆربەی خەڵکەکە ووتیان (مرد)، لینجا یەسوع گرتی‌و هەڵیساندەوە سەرپێ‌و ئەویش هەڵسایەوە، لەو کاتەی چووە مالەوە، قوتابیەکان بە تەنهایی لێیان پرسی ((ئێمە بۆ نەمان توانی دەریکەین؟)) پێ‌ی ووتن ((ئەم جۆر جنۆکانە دەرناکرێن مەگەر بە نوێژنەبێت))[٥٥].

وە لە کتێبەکانی دیان‌و جوولەکەدا ناوی ئیبلیس بە چەند ناونانێکی ترسێنەرو تۆقێنەر هاتووە وەك گەورەی ئەم جیهانە (سید هذا العالم) ((یوحنا ١٤: ٣٠)، وە سوڵتانی تاریکی ((لوقا ٥٣/٢٢) و گشت نەخۆشیە دەروونیەکان‌و عەقڵیەکان کە مرۆڤ دووچاریان دەبنەوە دراونەتە پاڵ ئەو. ((مرقس ٩ : ١٥-٨) و (مرقس ٥ : ٢-٥) و ئینجیلی متی ئاماژەی بەوە کردووە کە دەرکردنی شەیتان بە مانای دەرچوونیەتی لە جەستەیەکی (ممسوس) ((متی ٤ : ٢٤)) وە هەروەها لەو کتێبانەدا چیرۆکی وا هەن کە باس لە دەرکردن‌و هێنانە دەرەوەی گیانی (النجسە)دا دەکەن! و مۆڵەتیان لە

عیسی (علیه السلام) وەرگرتووە بۆ ئەوەی بچێتە ناو جەسەی بەراز مرقس (٥: ١-٢٠) و ئەو دەسەلاتەشی داوە بە ١٢ کەس کە ناوی ناون بە نێردراو بۆ هەلسان بەو کارانە و دەسەلاتی داونەتێ کە زال بن بەسەر شەیتانەکاندا. مرقس ((٣: ١٣-١٦)).

وە چەند نووسەرێك وزانایەك بەشداری تاقیکردنەوەکانی روحانیان کرد کە بانگێشتەی ئەو مەزهەبەیان دەکرد، دوایی، لەو تاقیکردنەوەیاندا لە قەلپی ومەبەستە شەیتانیەکان ومەرامە گومان لێکراوەکانیان تێگەیشتن، لێی کشانەوەو بەرائەتی خۆیان راگەیاند لەو کارو بیرۆکانەدا، لەوانەش د. محمد محمد حسین کە چوو بووە ناو ریزەکانی روحانیەت لە میسر لە سەرەتای دروست بوونیدا، دوایی بۆی روون بووەوە کە ئەمە ئاینێکی تازەیەو زایۆنزمی جیهانی تێکدەر بەرێوەی دەبات بە دەزگاو دەسەلاتی ئاشکراو نهێنی‌یەکانی، بە تایبەتیش ماسۆنیەت، کار دەکات لە پێناو سرینەوەو قەلاچۆکردنی گشت ئاینەکان، تەنها جولەکە نەبێت، لە ژێر ناوی برایەتی مرۆڤایەتی کە گشتیان کۆدەکاتەوە، هەروەها ئەو دەست تێوەردانو کارتێکردنە دەنگی وجولەیی ورەنگی وکرداریەی ئاشکرا کرد کە بەکاردەهێنران لە کردارەکانی ئامادەکردنی گیانەکان بۆ کارتێکردن لەسەر ئامادەبوان، بە رێگای موگناتیسیو شێواندنی هۆشیاری و توانایان، کە رۆلێکی بەرچاوو کاریگەری هەبوو لە پشت کردن لەو تاقیکردنەوانەداو وتی: من دلنیا نیم لەو رەنگە سورە کالەی کە گشت شتێکی تیادەکرێتو دێو دەچێت، ونەتوانم جوولە لاورینگ بوەکان (المتشنجه) شیتەل بکەمەوە، هەورەها باسی لەو دەنگە فووکردنە بێزارکەرو پرخە پرخە نالەبارەی کرد کە لە دەمی پێناو (وسیط)ەکەوە دەردەچێ لە کاتی چارەسەرکردنی بەناو رۆحانی، هەروەها ئاماژەی بەو زمانە نادیارە کرد کە قسەی پێ دەکات بەو بیانووەی کە ئەوە زمانی گیانەکانە، خۆپێشاندانی بە درۆ کە لە ژیان دوورکەوتۆتەوەو بێ هۆش بووەو، ئەو بارەو کەشەی کە هەبوو لە نێوان ئەو پێناوەو مامۆستاکەی لەو جۆرە هونەرەدا،

که أحمد فهمي ابو الخير ...و گوێ نەدانی مامۆستاکەی بـە تێبینی‌یـەکانی، هـەموو ئـەو شتانە وای لێ‌کردن کە بە هێمنی لەو جۆرە دانیشتنانە پاشە کشێ بکات.

هـەروەها حسن عبدالوهـاب، بەهـەمان شێوە، قسـەکردنێکی سـلفەربوش (پێغەمبەر)ی بەناو روحانیەت، رایهەژاندو کاری تێ کرد، کە وتبوی: ئێمە وەلائمان بۆ کتاب و پێغەمبەرو عەقیدە نیـە بـەڵکو تەنـها بـۆ خوایـە، واتـە، ئـەو، پێغەمبـەرەکان و کتێبەکان لـە خودا دادەبڕێ، بۆ ئەوەی خۆی بەسەربەخۆیی پەیامی لێ‌وەرگرێت بـەپێی ئارەزووەکانی. وە بە دیاری دەخات و روونی دەکاتەوە ((کە ئەو کەسانەی لەو جـۆرە دانیشتنانە ئامادەدەبوون، لـە دانیشتنی ئامادەکردنی گیانەکان واگومان دەبەن کە ئەوانە گیانی ئەو کەساندن کە بەر لـە ئێمەدا ژیاون لە خـزم و دۆسـتان، جگـە لـە شـەیتان و هاوەڵی جنۆکە هیچی تر نەبوون و لـە خـەڵکیان دەشـێواند بـە هـەموو جۆرێـك ئـەو کەسەش بە تەواوی و بەیەکجاری گەڕایەوە لای خواو داوای لێ‌خۆشبوونی لە خوا کرد لەو شتانەی کە کردوویەتی و ئەنجامی داون چ بەگفتارو چ بـە کـردارو نووسـین لـەو بابەتەوەو، گەڕایەوە بۆ قورئـان و سـوننەت و نـوێ کردنـەوەی باوەڕەکـەی، ئەوەشـی ئاشکرا کرد کە ئەوەی روحانیەکان بانگێشەی بۆ دەکەن راست نیە لـە زانینی زانیـاری ئەزموونی روح، و ناتواناییان لـەسەر اختراق کردنی روح.

## قورئـان چی دەڵێ دەربـارەی سیحر؟

نەتەوەی ئیسلام دەبێ پەندو ئامۆژگاری لـە بنی ئیسرائیل وەربگـرن، ئەوانـەی کتێبی خوایان وازلێهێناو پشت گوێیان خست و کاریان پێ‌نـەکردو باوەڕیشـیان بـەو قورئانە نەهێنا کە دابەزیردت. سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لـەگەڵ ئەوەی کـە قورئان دان بە وەندە حەقەی کەماوە لـە نێو کتێبەکانیاندا دەنێت، کە نەکەن وەك ئەوان بکەن چ کەم و چ زۆر، چونکە بەنی ئیسـرائیل پـەنایان بـردە بـەر شـتێك کـە شـوێن

کتێبەکەی خوا بگرێتەوە، هەر لە سیحرو ئەفسانەو خەیاڵ هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ كِتَابَ اللَّهِ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لا يَعْلَمُونَ * وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُو الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلا يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنْ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ (البقرە / ١٠١ - ١٠٢)

واتە سیحر بو بە رێنیشاندەری کارەکانیان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ غەیبو واقیعداو، پەیڕەوی ئەو شتانەیان دەکرد کە شەیتانەکان دەربارەی سەردەمی سلێمان پێغەمبەر (علیە السلام) دەیانگێڕایەوەو لەوەی کە دەیان گوتو درۆیان هەڵدەبەست کە گوایە سلێمان پێغەمبەر (علیە السلام) سیحری بەکاردەهێنا بۆ چەسپاندنو جێگیرکردنی دەسەڵاتیو، بەزۆر کارپێکردنی هێزە جیاجیاکان لە ژێر فەرمانی خۆیدا، ئەوەش بۆ گومڕاکردنی خەڵكو بە رەوا پێشاندانی کارە سیحریەکانیان، قورئانی پیرۆزیش جەخت لەسە رئەوە دەکاتەوە کە سلێمان پێغەمبەر (علیە السلام) بە هیچ شێوەیەك سیحری ئەنجام نەداوە لەو بوارەدا، وە بۆ ئەو مەبەستەی کە ئەوان دەیدەنە پاڵی، چونکە ئەگەر کاریوای کردبێ، ئەوا دیارە (نعوذ باللە) کافر بووە: ((وما کفر سلیمان)) چۆن پێغەمبەرایەتیو کوفر بەیەکەوە تەریب دەبن؟ وە یان چۆن سروشی خوایی لەگەڵ خەیالاتی شەیتانی یەك دەگرنەوە؟ ((لکن الشیاطین کفروا یعلمون الناس السحر))، جارێکی تر ئەوە دووپات دەکاتەوە کە سحر کوفرە، وشەیتانەکان کوفریان کرد کاتێ خۆیان کرد بە مامۆستا بۆ فێرکردنی خەڵکی بەو جۆرە هونەرە پیسو تێکدەرە.

((وما انزل الملكين ببابل هاروت و ماروت))، قورئان، ئـــەو ئەفـــانە مێژوویـە باوە نەفی دەکاتەوە کە روخـــارێکی پـیرۆزی لەبـەرکراوەو دراونەتـە پـاڵ ئـەو دوو فریشتە بەرێزانە ((هاروت و ماروت)) کە لە شاری (بـابل) نیشـتەجێ بـوون، چونکـە فریشتە پابەندن بە مل کەچییان بۆ خوا، پەیام و سروش جگە لە خوای گەورە لـە هیـچ کەسێکی تر وەرناگرن و هیچ فەرمانی دیکەشیان پێناگات ﴿لا يَعْصُونَ اللَّهَ﴾ (التحريم / ٦)، هەروەها ﴿لا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُمْ بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ﴾ (الأنبياء/ ٢٧).

وە (ما) لـە (يعلمون الناس السحر وما انزل على الملكين) بۆ (نەفی) هــاتووە، واتە نەفی کردنی دابەزینی سیحر بەســەر ئـەو دوو فریشـتەیە نـەك بـە مانـای (الـذي) هەروەك چەند موفەسرێك، وای بۆ دەچن.

وە ابن کثیر لە ابن جریری نقل کردوە لــە تەفسـیرەکەیدا (تفسـير الطـبري)دا ئەویش لـە قەوڵی ابن عباس کە لـە تەفســیری ئـەم ئایەتـەدا دەفـەرموێت: ((ومـا كفـر سليمان: وما أنزال الله السحر على الملكين، ولكن الشياطين كفروا يعلمون الناس السحر ببابل، هاروت وماروت، فيكون مضياً بالملكين جبريل وميكائيل عليــهما الـسلام))، ومـا أنزل على الملكين ببابل هاروت و ماروت) لێرەدا مەبەست لە دوو فریشتەیە (جـبريل و ميكائيل)ە (عليهما السلام)، چونکە سیحربازە جوولەکەکان -هــەروەکو هــاتووە- وا زەعم دەکەن کە خـــوا ســیحری دابەزاندۆتــە ســەر ســلێمانو داود پێغەمبــەر (علیـهما السـلام) لەسەر زاری جبریل و میکـــائیل (علیـــهما الســـلام) خـــوای گـــەورەش بـــەدرۆی خستەوە و بە پێغەمبەرەکەشی (محمد) صلى الله عليــــه وســـلم راگـــەیاند کــە جـــبریل و میکائیل هەرگیز سیحریان بە کەس رانەگەیاندووەو سلێمانیشی (عليه الســـلام) بـــەری کرد لەو تۆمەتەی کە دابوویانە پاڵی، هەروەها پێی راگــەیاند کــە سـیحر لــە کـاری شەیتانەکانە، هەر ئەوان خەڵکی فێری سیحربازی دەکەن لـە بـابل، ئەوانـەی فێریشـیان دەکەن دووکەسن ناوی یەکێکیان هاروتەو ئەوی دیکەشیان ماروت)[٥٦] ە.

وە ئەو فەرموودەیەی کە لە مسندی امام احمد دا هاتووە، کە بەشـی دوایـی‌و پەیوەندی هەبێت بە بابەتی دابەزینی ئەو دوو فریشتەیە لە ئاسمان (هاروت و ماروت) و هەڵس‌و کەوتیان بۆ گومڕایی، پاش ئەوەی کە خوای گەورە تاقی‌ی‌کردنەوە، وە لە ابن عمرەوە دەگێڕنەوەو ئەویش لە اسنادەکەیدا دەگاتـەوە بـە (کعـب الاحبـار) و ئـەوەی دەشیگێڕێتەوە لە عبدالله وە ئەویش لە کعب الاحبارە، وە ئەو اسنادە (دروســتترینیانە و سەلمێنراوەکە عبدالله ی کوری عمر) گێڕاویەتیەوە ... هەروەکو ابن کثیر دەڵێ: ((وتوێژ لەسەر ئەو بابەتە کراوە گەیشتنە ئەوەی کە ئەم جۆرە بۆچوونــە لــە (کعـب الاحبـار) وەرگیراوەو ئەویش لە کتێبەکانی (بنی اسرائیل)ی وەرگرتووە، ئەمەش لە تەفسیرەکەیدا ئاماژەی پێ‌کراوە[٥٧].

((وما یعلمان من أحد حتی یقولا انما نحن فتنة فلا تکفر))

بۆ جاری سێیەم قورئان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سـیحر کوفـرە، و ئەو فێربوونەش بە گوێرەی روایەتی ابن عباس لە لایەن دوو پیاوە وە بووە بەناوی ئـەو (هاروت و ماروت)ەی کە ئەو پیشەیە فێربوون هەروەك خەڵکانی تر لە شەیتانەکانەوە، ئەو دووکەسە توانیان لەوکارە هونەرمەندو کارامە بن و تاوایان لێ‌هات بوون بە مایـەی فیتنە بۆ خەڵکانی تر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکیان ئاگادار دەکردەوە کە فێری ئـەو پیشەیە نەبن، چونکە وایێ دەچێت کە ئەو دووانە کەوتوونەتە ناو بۆشـایی فریـودراوی سیحرو لەدەست چوونی ویستیان، لە ژێر کاریگەری زاڵ بوونی شەیتانی بەسەریانەوە، بۆیە دەیان ویست کە گوناهیان زیاتر نەبێت‌و یان قوربانیەکان پتر نەبن.

﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ﴾ (بقرة / ١٠٢)

ئەم جۆرەش پێی دەوترێت سیحری جیاکردنەوە، بەپێی فەرهەنگی سیحربازەکان.

﴿وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ (بقرة / ١٠٢)

سیحربازو جادووکەران، چ هاروت‌و ماروت، لە مێژوودا، یان براکانی دوای ئەوان‌و هاوچەرخەکان ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن مەگەر بە ویسـتی خـوای گـەورە

نەبێت، ئیتر پێویست بە ترسان ناكات لە سیحربازان، وەیان خۆ خەریك كردن بە بەرپەرچ دانەوەیان بە هەمان شێوەی ئەوان، بە لەكارخستنی سیحر بە سیحرێكی تر، بەڵكو غەدرو كارتێ كردنیان لە كاتێكدا دەبێت ئەگەر لە خودی مرۆڤەكەدا ئامادەیی بڕوا پێ كردنیان هەبێت، یان ترسان و تۆقان لە ئەركەكانیان، یان تاوان ئەنجامدان و لادان لە ڕێگای بەرنامەی خواو شوێن كەوتنی شەیتانی، وای لێدەكەن كە بەدەم سیحرو پەیامەكەیانەوە بچن.

﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلا يَنفَعُهُمْ﴾ زیان و ماڵ وێرانی لە فێربوونی سیحر دایە، چونكە زیان بەخشەو هیچ سوودێكی لێبە دەست نایێ، فێربوونی بە كفر دانراوە لە چەند جێگای جیا جیا دا لە قورئاندا باس كراوە، وە ئەگەر زیان بەخش و شەڕێكی تەواو نەبووایە بە كوفر دانەدەنرا ﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنْ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلاقٍ﴾ (بقرة / ١٠٢)

ئەم جۆرە هەرەشە ترسێنەرە بەسە بۆ یەكێك كە كەمترین پلەی باوەڕی هەبێت ئەگەر بێتو سیحر ئەنجام بدات وەك جولەكەكان، كە ڕێنمایی خواییان گۆڕییەوە بە سیحرو هیچ بەخت و بەشێكیان نابێت لەدوا ڕۆژدا، لە كاتێكدا كە باوەڕو، فێربوونی سیحرو ئەنجامدانی بەیەكەوە كۆنابنەوە.

﴿وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ (بقرة / ١٠٢)

ئەو بازرگانیەی كە مەسەلەی سیحری تیا بەڕێوەدەچێت، مامەلەكردنێكی گۆڕینەوەیە لە نێوان سیحرو ئەو كەسەی كە چارەنووسی خۆی دەدۆڕێنێ لەدوارۆژداو دەخرێتە ناو ئاگر، ئەوەش بەدترین نرخێكە كە مرۆڤ دەیژمێرێت لە بەرامبەر بە دەست هێنانی فاكتەری كارتێكردن لە خەڵكانی تردا، كە دامەزراوە لەسەر خەیاڵ و فریودان، كە بازرگانی پێ دەكەن و بەگەڕی دەخەن بەناوی ئاینێكی (دەست تێ وەردراو) یان ڕامیاریانە (سیاسیانە).

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَمَثُوبَةٌ مِنْ عِندِ اللَّهِ خَيْرٌ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ (بقرة / ١٠٣)

هەروەها ئەم ئایەتەش ئاماژە بەرەدەکات کە فێربوونی سیحرو ئەنجامدانی زیانکردنی خەڵکانی تر لە باوەڕەوە نیە، لەبەرامبەر باوەڕیش تەنها کوفرە، نەك پارێزکاری، بەڵکو گوناهبارییە.

ئەگەر بهاتایە ئەو سیحربازانە باوەڕیان بهێنایەو پارێزکاریان بکردایە ئەوا پاداشتی خواییان لە دونیاو لە دوارۆژدا بە دەست دەهێنا. ئەگەر ژیر بوونایەو ئەو پاداشتەیان رەچاو بکردایە ... ئیتر ئەو هەرەشە خودایییە بەسە بۆ ئەو کەسەی ئاستێکی ئیمانی هەبێت، هەرچەندە کەمیش بێت، بۆ ئەوەی دەست لەو تاوانەی هەڵگرێت، بە تایبەتیش، دوای ئەوەی قورئانی پیرۆز روونی کردەوە، لەوەی کە بنی ئیسرائیل لەئەنجامیاندا لە گۆڕینەوەی رێنمایی خوایی بە چەند تقوسێکی سیحرىو پەیڕەوکردنیان بۆ ووتە شەیتانیەکانی هەڵبەستراو بەسەر موڵکی سلێمان (علیه السلام)، کە بەکاری سیحری مەملەکەتی بەڕێوەبردبێتا، بەڵام خوای بالادەست سلێمان پێغەمبەری (علیه السلام) بەرىو بێگەرد کرد لەو کوفرەی کە دابویانە پاڵی کە خۆی لە سیحردا دەنواند.

هەروەها خوای میهرەبان ئەوەشی بۆ بەنی ئیسرائیل روون کردەوە کە ئەگەر بهاتایەو باوەڕو پارێزکاریەکی باشیان پەیڕەو بکردایە، زۆر باشتر بوو لە کارە جادوکەریەکەیان کە ئەو کات زۆر باو بووە لە شاری بابل، کە سیحربازی وەك کارێکی رەسەنو ئاسایی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا لە عێراقی کۆندا هەروەکو (ئەصحاح ١٠٩/٤٧) و ناحوم ٣:٤، ئاماژەیان پێکردووە ... ، هەروەها ئارەزووی خوێندنەوەی بورجەکانو فەلەکیو نوشتە، باڵی کێشابوو بەسەر ئەو وڵاتە ... جولەکەکانیش سیحریان لەوانەوە وەرگرت، هەرچەند کتێبەکەیان قەدەغەیانی دەکردنو هەڕەشەشی لێدەکردن لە فێربوون و ئەنجامدانی، وە زۆر بەڕاشکاویش ئاگاداری دەکردنەوەو داوای لێدەکردن کە واز لەو کوفرە بێنن و لاسایی گەلانی تر نەکەنەوە وەك کەنعانیەکان ... (فێری ئەوە نەبێت کە کارێکی پیسی وەك ئەو میللەتانە

ئەنجام بدەیت، کەسێکتان تیا نادۆزمەوە کە، چوونە ناو ئاگری کوڕەکەی یان کچەکەی بە ئاسایی بزانێ، و نە کەسێکی وا کە فالچیەتی بزانێ، و لەسەری بەردەوام بێت، و گەشبینیش بێت پێی، و نەجادوکەر و نە نوشتە نووس، و نەکەسێکی واش کە شت لە جنۆکە داوا بکات وشوێن کەوتووی بێت، و نەکەسێکیوا کە راوێژ بەمردوو بکات چونکە هەر کەسێ شتی وابکات ئەوا پەروەردگار رقی لێیەتی. هەروەها تۆمەتی سیحریان دایە پاڵ (یعقوب)یش (علیه السلام).

ئەو جۆرە پراکتیکە سیحریە بەردەوام بوو، بگرە تا چەرخی ئیسلامیش، و لە شاری مەدینەشدا ئەو جادو کەریەیان ئەنجام دەداو پڕوپاگەندەی ئەوەشیان دەکرد کە ئەوان بەو جادوانەیان رێگە دەگرن لەوەی کە موهاجیرەکان منالّیان ببێ، دوای ئەوەی ماوەیەك لە مەدینە منالّیان نەدەبوو، تا ئەو رۆژەی عبدالله ی کوڕی زوبێر چاوی بە دونیا هەلّێناو تێکرایی شاری مەدینە لەگەلّ دەنگی (الله اکبر) هاتە لەرزین، وەك مژگێنیەك بە نادروستی وپڕوپوچی ئەو شتەی کە پڕوپاگەندەیان بۆ دەکرد.

جولەکەکان کتێبێکیان هەیە بە ناوی (القبالا) کە تایبەتە بە سیحرو لە دە بەرگدا نووسراوەتەوە بە (عبری) و تەنها، گەورە ساحیرانیان دەتوانن چاویان پێی بکەوێت، ناوەڕۆکەکەی بریتییە لە هاوکێشەی سیحربازی، و هێمای جەبری، و پیلانە شەیتانیەکان، هەندێکیان تێکەلّ کراون بە چەند دەستکەوتێکی زانستی.

﴿وَقَالَ مُوسَى يَافِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ * حَقِيقٌ عَلَى انْ لَا اقُولَ عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ قَدْ جِئْتُكُمْ بِبَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِي إِسْرَائِيلَ * قَالَ إِنْ كُنتَ جِئْتَ بِآيَةٍ فَأْتِ بِهَا إِنْ كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ * فَأَلْقَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُبِينٌ * وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاءُ لِلنَّاظِرِينَ * قَالَ الْمَلَأُ مِنْ قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ * يُرِيدُ انْ يُخْرِجَكُمْ مِنْ ارْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ * قَالُوا ارْجِهِ وَاخَاهُ وَارْسِلْ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ * يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَاحِرٍ عَلِيمٍ * وَجَاءَ السَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوا إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِنْ كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ﴾ (الأعراف / ١٠٤ - ١١٢).

دوای ئەوەی کە باسی سیحری جولەکەمان کرد، ئەوا جارێکی تر قورئانی پیرۆز ئاماژە بە جادوی میسریەکان دەکات کە فیرعەون کردبووی بە قەڵغانێکی بێ توانا دژی ئەو پەیامەی کە موسی (علیه السلام) هەڵیگرتبوو کە بە بەڵگەی ئیمانی بناغە بەند کرابوو، بە دوو ئایەت لە ئایەتەکانی خوای باڵادەست، ئەوانیش، بەکارهێنانی گۆچانەکەیو فڕێدانی لەناو کۆمەڵە خەڵکانێك وبوونی بە مارێکی گیان لەبەر، کە هیچ گومانێكو خەیاڵاتێك لە ماریەتی‌دا نەبێت وخشۆکێ بکات بەسەر زەوی‌دا، و دەرهێنانی ئەو دەستە رەش پێستەی کەش وهەوای میسری، و درەوشانەوەی بەڕەنگێکی سپی، نەك لەبەر نەخۆشی (بهاق)، بەڵکو وەك ئایەتێکی خوایی کە توانای بەسەر هەموو شتێکەو باڵادەستە لەسەر گۆڕینی باروذۆخ وماهیەتی شتەکان، بەڵام دەست وپێوەند وسەرکردە سیاسیەکان هەموو شتێك سیاسیانە تاوتوێ دەکەن ولە ڕوانگەی پەیوەندی ئەو ئایەتانە بە دەسەڵات وفەرمانڕەوایەتیان بەتایبەتی ئەگەر جۆرە هەڕەشەیەکی تیا بێت بۆ لەناو چوونی دەسەڵاتەکانیان، هەرچەندە ئەو هەقە سەلێنراو و بەڵگەداریش بێت!!! یەکسەر لەو هەقە تەفسیرێکی (وضعي) بۆ دەکرێت بە پێی (ثقافة العصر) و، مەبەستە دونیایەکانی لێ دەردێنن. لەگەڵ ئەوەی کە سیحر باوی سەندبوو لە میسری کۆنداو (کهان)ەکان بەکاریان دەهێناو تایبەتمەندیان تیا وەرگرتبوو، سوودیان لێوەردەگرت بۆ پارێزگاری پێکردن لە ڕژێمی فیرعەونیو مل کەچ کردنی گەل بە جێبەجێ کردنی مەبەستەکانی فیرعەونو هەندێ مەبەستی پزیشکی، و دابین کردنی بەختەوەری دوای مردن، وگشت تەلەسم وهاوکێشەکانیشی لە کتێبێکدا کۆکرابووەوە وەك کتێبی (الموتى)، لەسەر دیواری ئەهرامەکانیش نووسرابوونەوە وەك نزاو پاڕانەوەو خۆپاراستنو تقوسی تایبەتی بۆ دابین کردنی نەمری بۆ مردووەکە.

لێرەدا هەلێکی باش و لەبار بۆ سیاسیەکان هاتەکایەوە، تا لەناو خەڵکی ساویلکەدا ئەوە بڵاوبکەنەوە کە ئاین وئایەتەکانی جۆرێکن لە سیحرو هەڵدەقوزرێتەوە

بۆ هاندانی بەنی ئیسرائیل کە دەربچن لە ژێر فەرمانڕەوایەتی سیاسیان. ئەمەش تەنها پیلانو تەڵەیەکە نراوەتەوە. پێشنیاریان کرد کە ڕووبەڕووبوونەوەکە دوا بخرێت تا ئەو کاتەی جادوکەرە کارامە وناودارەکانی میسر ئامادەدەبن، (موسی)یان (علیه السلام) بە ساحیرێکی کارامە ناوزەدکردو هەردەبێ ساحیرێك لە ئاستی ئەو سیحرەیدا بێت بۆئەوەی بتوانێ سیحرەکەیان ئاشکرا بکات ...!!!

﴿وَجَاءَ السَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوا إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِنْ كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ * قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ * قَالُوا يَامُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ نَحْنُ الْمُلْقِينَ * قَالَ أَلْقُوا فَلَمَّا أَلْقَوْا سَحَرُوا أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءُوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ * وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ * وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ * فَوَقَعَ الْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ * فَغُلِبُوا هُنَالِكَ وَانْقَلَبُوا صَاغِرِينَ * وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ * قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ * رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ﴾(الأعراف /١١٢-١٢٢).

بەم جۆرە جادوکەرە پیشە گرەکان کۆبوونەوە، ئەوانەی هەوڵی کۆکردنەوەی سامان ونزیك بوونەوەن لە فەرمانڕەوا، بۆ بە دەست هێنانی پلەو پایەو ناوبانگ، ئەویش بە حەشاردانی حەق وقەدەغەکردنی سەرهەڵدانی، هەمان هەڵس وکەوتی ئەو جادوکەرانەو هەندێ پیاوانی ئایینی کە زانستی ئاینیان کردوە بە پیشە زانستەکەیان بەکاردێنن ودەیخەنە گەڕ بۆ جێگیرکردنی دەسەڵاتی ملهور (طاغوت)ەکان بەسەر زەویدا، و بەردەوام پێدانی بارو دۆخە نادادوەریەکەیان، وقەدەغەکردنی بەرقەراربوونی حوکمی (ما أنزل الله) و، وابکرێت کە یاسا تەنها یاسای خوای گەورە بێت وبەندایەتیش هەر تەنها بۆ خوا فەراهەم بکرێت.

فرعەون، وەك تاغوتێك، خاڵی لاوازی وچاوچنۆکی ساحیرەکانی باش دیاریکردبوو، ودەیزانی کە پارەپەرستی ونزیك بوونەوەیە لە فەرمانڕەوا، بۆیە بەڵێنی

پێیان بە جێبەجێ کردنی گشت داخوازیەکانیان: ﴿وَجَاءَ السَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوا إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِنْ كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ﴾.

موسی (علیه السلام)، فیرعەون ودەست وپێوەندەکانی ئاگادارکردنەوە لە ئاکامی شت هەڵبەستن بۆ خواو درۆپێکردن، بەڵام سوودی نەبوو، بەم شێوەیە هەموو شێوەو شێوازو هۆکارەکانی سیحرو فێڵەکانی ساحیرەکان کۆکرانەوەو بەشێوەیەکی کۆمەڵی یەك دەست ویەك پیلان هاتن بۆ رووبەڕووبوونەوەی هەق ﴿قَالُوا يَامُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ نَحْنُ الْمُلْقِينَ﴾.

لێرەدا ساحیرەکان ئازادی هەڵبژاردنیاندا بە موسی (علیه السلام) لە دەست پێکردن یان رەددانەوە، (موسا)ش (علیه السلام) رەددانەوەی هەڵبژارد ﴿قَالَ أَلْقُوا فَلَمَّا أَلْقَوْا سَحَرُوا أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءُوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾ سیحرەکەشیان بەرچاو بوو کە خۆی لە هەموو تواناو زانیاری ناودارترین وبەتواناترین سیحربازەکانی میسر دەنواند، بەڵام هیچی لە واقیعەکە نەگۆڕی بەڵکو ئەو پەڕی هەوڵەکانیان سیحرکردن بوو لەچاوی خەڵکە ئامادەبووەکەو تەنها کاریگەری دروست کردبوو لەسەر، هەستی بینینیان بۆ دیمەنەکان، وە ووشەی (استرهبوهم) وەك سێبەرێکی تۆقێنەری سازدراو بەکارهێنرا، لە لایەن سیحرابازەکانەوە، وەك ئەوەی بیانەوێ بینەرەکان بترسێنن بە جوولەکانیانەوە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەتاڵیەتی، ئەو سیحرە گەورەیەی کە ئەنجامیاندا بریتی بوو لە گۆڕانی گۆچان و پەتەکانیان بە چەند مارێکی خشۆك لەبەر چاوی موسی‌دا (علیه السلام) ﴿قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِنْ سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى﴾ (طه / ٦٦).

ئەو ئایەتەش ئەوە روون دەکاتەوە کە کردای سیحربازەکان شتێك نەبوو کە زاتی بارەی دەستبازەکان بگۆڕێت. بەڵکو گریمانەیەك بوو کە هیچ بنەمایەکی زانستی نەبوو وکاریگەریشی بەسەر شتەکانەوەدا نەبوو بۆیە هەر کە موسی (علیه السلام) گۆچانەکەی فڕێدا، بوو بە مارێکی گەورەی گیان لەبەرو گشت دارو پەتی

سیحربازەکانی هەڵلووشی بە جۆرێك جۆرە ترسێکی خستە دەروونی موسی (علیه السلام).

بەم شێوەیە سیحرە درۆو قەڵپەکە بەزی، کە پشتی بەستبوو بە یاری کردن بە هەستی بینین، و دەگەڕایەوە سەر ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەریان هەبوو لەسەر خەیاڵی مرۆڤ وبەکارهێنانی تۆقاندنی زانستی. هەق سەرکەوت و چەسپاو بوو ناڕەوایەتی سیحریش لەکار خرا.

ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە سیحر ڕەوا نیەو پووچەڵکردنەوەشی بە سیحرێکی وەك ئەو نابێت، بەڵکو بە هەقێکی سەلمێنراو و بەڵگەدار دەبێت.

(فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُوسَى * قُلْنَا لا تَخَفْ إِنَّكَ أَنْتَ الأَعْلَى * وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ ولا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى) (طه / ٦٧-٦٩).

ئەنجامدانی سیحر بە درێژایی مێژوو، هۆنینەوەو دارشتنی فێڵە، واتە کردارێکە لە پشت پەردەوە دادەڕێژرێت و جۆرە تقوسێکە لە نهێنیدا تێك هەڵدەکێشرێت تا ئەو کاتەی دەخرێتە بەرچاوی خەڵك و سەرنجی چاوەکانیان رادەکێشی. بەڵام سیحربازان سەرکەوتوو نابن، لە هەوڵەکانیانداو بۆ هەر کوێ بڕۆن و بچن و ڕووبکەن، چونکە ئەوانە تەنها شتێکی خەیاڵاوی بەجێ دەگەیەنن و داواکاری ئەنجامدانی شتێك دەکەن کە هیچ بەڵگەو راستیەکی نیە، و بەڵێن دەدات بە جێبەجێکردنی وئەنجامدانی شتێك کە هەرگیز دانەمەزراوە لەسەر بناغەیەکی ڕاست و ڕەوا.

(فَغُلِبُوا هُنَالِكَ وَانقَلَبُوا صَاغِرِينَ) (الأعراف / ١١٩).

بەم شێوەیە سەرکەوتن بۆ ئایەتەکانی خوا بوو، و سیحربازەکان دۆڕان ڕەهەستیان بە لاوازی وبچووکی خۆیان کرد لە بەرامبەر ئەم ئایەتانەو جوان تێگەیشتن، چونکە ئەوان خۆیان پسپۆڕ بوون لە بواری سیحرو سیحربازیداو زانیان کە لەسەر ڕێگایەکی چەوت بوونەو هەستیان بە تاوانباری و گوناهباریەتی خۆیان کرد، بەو

کوفرەی کە تا ئێستا ئەنجامیان داوەو خەڵکیان پێ تۆقاندووەو سەریان لێشێواندوون بۆیە، هەرزوو دانیان بە سیحربازیەتی خۆیان نا لە بەرامبەر ئەو بەڵگە گەورەیەی کە موسی (علیه السلام) پێی راگەیاندن و ووتیان ((امنا برب العالمین رب موسی وهارون)) نەخشەو پیلان و سیحرەکەش بەسەر سیحربازو ئەوەی لە دوایاندا دەوەستان هەڵگەڕایەوە، بەلام چۆن هەڵگەڕانەوەیەك؟

فیرعەون خۆی ماڵی خۆی وێران کرد، و خەڵکی کۆکردەوە بۆ ئەوەی بەڵکو سیحربازەکان بتوانن شکستی بە موسی (علیه السلام) بێنن، بەلام ئەمە ویست و خواستی خوایە دەبێ زۆرترین ژمارەی خەڵك ئەو دیمەنانە ببینن بۆ یەك لاکردنەوەی هەق لە ناهەق.

## شەیتانەکان و جادوکەرەکان پیشەنگی راگەیاندنی هاوچەرخن

لەگەڵ ئەو هەموو ئایەتانەی کە سیحرو فێربوونیانی حەرام کردوە، یان پشت بەستن بەشەیتانەکان، لە راگەیاندنەکانی ئەمڕۆماندا چەندین فلیم و زنجیرەو فلیمی کارتۆنی نمایش دەکرێن، کە رووداوەکانیان بە لێکدانەویەکی سیحری لێك دەدەنەوە، کە کەسانی وا بەرچاو دەکەن کە گوایە هێزێکی لە رادەبەدەریان هەیەو لە ڕێگای چەند جوڵەیەك یان پلاك یان ئامێر، و ئەوانەش کار لە شتەکان دەکەن نەك وەك یاساو هۆکارەکان و ئەو هاوکێشانەی کە خوای گەورە (ملکوت)ی لەسەر بنیات نابوە.

لێرەدا فلیمە سیحریەکان، و چرا، و کەرستەکان، و گەسك و نیشانەی ئەوتۆ هەن کەسیستەمی ژیان سەراو گێردەکەن، وە شتی سەرسوڕهێنەری لە رادە بەدەر ئەنجام دەدەن وبەخێرایەکی زۆر بگرە، بێ خایاندنی کاتێکی وا کە حیسابی بۆ بکرێت، ئەمە سەرەرای ئەوەی وا لە منالآن دەکات کە ئەنجامدانی سیحریان لا خۆشەویست بێت و هەوڵی فێربوونی بدەن و دڵیان بە سیحر بکرێتەوە، لەسەرەنجامیشدا وای لێدێت

دەکەوێتە ناو ئەو گوناهە گەورەیە لە دوا ڕۆژدا، کە قورئان بە کوفری لەقەڵەم داوە، ئەمە وا لە منداڵ دەکات کەتێڕوانینێکی سیحری لا دروست بێت نەك واقیع بینانەو ئەزمونیانە، یان باوەڕێك بە غەیب کە وەرگیرابێت لە قورئانو سونەتە دروستەکان بۆ دەورو بەرو ئایەتەکانی خوای گەورە لەم بوونەوەرەدا، بۆیە هەمیشە هەوڵی بە دەستهێنانی چارەسەری ئامادەکراو و لە ڕادەبەدەرو لەناکاویەکانە، و ئیتر بیر لە کۆشش وخەبات ناکاتەوە بۆ پێشکەوتن لە ژیاندا، و زووبەزوو دەکەوێتە ناو هەڵدێری خورافیات وئەفسانەکان.

هەروەها هۆکارەکانی ڕاگەیاندن فلیمی تر پەخش دەکەن لە شێوەی مرۆڤێکی تەواو (سوپەرمان)، وفلیمەکانی (سێرك) کە یاری پێکردنی سیحریان تیا بەکار دەهێنرێت، ولای بینەرەکان شیرین دەکرێن و کاتەکانی خۆیانیان تیا بەفیڕۆ دەدەن وهانی خەڵکیش دەدەن بۆ فێربوونی ئەم جۆرە بەناو (هونەر)ە! سەرەڕای نەهی کردنی قورئان لە فێربوونی وفێرکردنیدا، وچینی ئافرەتیش تیایدا بەشداری دەکەن بە جل وبەرگێکی تایبەتی بەو جۆرە (هونەر)ە کە زۆر نزیکە لە لەش و لار ڕووتی، بەڵکو لە ڕووتی زیاتر کاریگەری هەیە لەسەر خەڵکی بۆ جۆشدانی ئارەزووەکانیان، وشوێن فەرمانەکانی ئیبلیس دەکەون لە دروستکردنی ئەم جۆرە سیحرە.

وە هەندێ فلیمە کارتۆنیەکانی وەك (کاسپەر)، جنۆکە وا نمایش دەکات کە هاوەڵێکی باشی مرۆڤە، و ئەو کارانەی کە مرۆڤ ناتوانێ ئەنجامیان بدات ئەوا جنۆکە بۆی ئەنجام دەدا، و لە کاتە پڕمەترسیەکان ڕزگاریان دەکەنو خزمەتگوزاری وایان پێشکەش دەکەن کە لە توانای مرۆڤدا نەبێت.

کە چی جنۆکە لە بیری ڕۆژئاودا وا نمایش دەکرێت وەك دروستکراوێکی ترسناكو دوژمنکارانەو دەم و چاو ناشیرینو ڕەزاگرانو هەمیشە لەهۆسەدان بۆ زیان گەیاندن بە مرۆڤ. بەمەش دوو تێڕوانین و دوو جیهانی دژ بەیەك لای منداڵ دروست دەبێت، یەکێکیان ڕق لێبوونەوەیە لە جنۆکەو دروست بوونی ترسو تۆقان بە

بەسکردنیان بەو شێوە خورافاتیانەی کە باون، ئەوی تریان، سەرسـام بوونـە پێیانـەوەو، گ.ورە بوونـی، دەسـەڵاتە سـەر سـوڕهێنەرەکانیان لای ئـەو منالـّـە پـاك و بێ گـەردە، وبەوەرێکی وای لا گرووست دەبێت کە جنۆکە دەستی هەبێت لـە ژیانی مرۆڤدا بە چاکە یاد، بە پێچەوانە.

ئەمەو قورئانی پیرۆز بەسەرهاتی نەتەوەکانی پێشووی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە، کـە گەیشتبون بە پلەیەکی بەرز (کە ئـەمڕۆ پـیـی دەوترێـت بنیاتنـانی شارستانی)، بـەڵام لەناوبراو روخێنران، چونکە پشتیان لـە بەرنامەی خوای گەورە کردبوو، وپێوەری ژیان لەسەر هەق وباوەڕ دانەمەزرابوو، بـەڵکو لەسـەر سـامان و چێـژو، ئـارەزوو، هـێزو، دەسـەڵات بـوو، ئێستاشـی لەگـەڵدا بـێ، ئـەم یاسـایە هـەرکاری پـێدەکرێو ئاگادارکردنەوەش هەر بەردەوامە، بگـرە هـەز لـە رەشـەبا وێـران کـەرەکان، وئـاگر تێبەربوونێکی مەزن کە دارستانە چڕەکان لەناو دەبـاتن‌و، ئـەو لافاوانـەی کـە شـارو دێیەکان رادەماڵێ، و ئەو بومەلـەرزانەی کە شارە پـڕ لـە دانیشـتوانەکان بـە هیـلاك دەبات، شارەجوانەکان سـەراوژێر دەکـات‌و نەخشـەی جوگرافـی وڵات دەگـۆڕێ، و بوسـێتی‌و بەرزبوونـەوەی نرخـەکان‌و کـەمی ئـاو، و ئـەو بەکۆیەکداچوونانـەی کـە پەیوەندیەکان دیاری دەکات، لەگەڵ ئەو هەموو ئاگادارکردنەوانە پەند وەرگرتن کەمن و نایەنە بەرچاو؟!!

بەڵکو هەندێك لـە رژێمەکان، زانیاریەکان دەشێوێنن کە پەیوەندیان هەیە بـەو کارەساتانە، ژمارەی راستی قوربانیەکان ئاشکرا ناکەن، و جارجـاریش هـەوڵی سـووك کردنی شوێنەوارەکانیان دەدەن بەناوی پاراستی (سمعە)ی دەوڵەت‌و یان ترسان لـەوەی کـ بە کەم تەرخەمی لـە راپەڕاندنی کارەکانیان تاوانبار بکرێـن، وە تـا ئێسـتاش نـەمان بیستووە نە لـە رۆژهـەلات، نـە لـە رۆژئـاوا، وبگـرە ئـەو راپۆرتانـەی کـە لـە وڵاتـە ئیسلامیەکانیش ئامادەدەکرێن. ئەو رووداوانـە تەفسـیرێکی ئیمـانی‌و پـەند وەرگرتـن و ئامۆژگاریانەیان بۆ ناکەن!!! بەڵکو دەیاندەنە پاڵ (خلل)ێکی ژینگەیی، بێ ئەوەی رۆڵی

خۆی دیاریکات لە دروست بوونی ئەو (خلل)ە. یان بەکارێکی پیلان گێڕی تەفسیر دەکات بێ لەوەی روونی بکاتەوە کە ئیمانو پارێزکاریەکەی چی بەسەر هاتووە؟ لەدابەزینو لاوازیو چ جۆرە ستەمێك ئەنجام دەداتو بەرەو چ جۆرە فسقێك کەناری گرتووە؟ هەروەها نەمان بیستووە لە ئەنجومەنی پیران، یان پەرلەمانێك، یان پەیمانگایەکی فیکری نا ئیمانی، گفتوگۆ بکەن لەسەر ئەو گەندەڵیە مرۆییەی کە هۆکارێکی سەرەکیە لەبەرپابوونی ئەو جۆرە کارەساتانە، جا چ جێی باسکردنی چارەسەریەتی؟

هەروەها قورئانی پیرۆز ئەوەشی روونکردۆتەوە کە هۆیەکانی لەناو چوونی نەتەوەکان، بەتێکڕایی یان بەش بەش، ئەو خراپەکاریەیە کە لە ئاکامی رابواردنو سنوور بەزاندندا سەر هەڵدەدەنو روو دەدەن.

﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا﴾(الأسراء / ١٦)

هەروەها دەسەڵاتی لۆژیکی هێزو رووکردنە نەمریو هەمیشە مانەوە لەسەر زەمین دا، بە دروست کردنی فابریکە ودەزگا سەربازیەکان، کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ * وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ * وَإِذَا بَطَشْتُمْ بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ * فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ (الشعراء / ١٢٨-١٣١).

خوای گەورە نموونەیەکی بۆ دەست نیشان کردووین کە، رێکی و پتەوی بیناو تەلارە ماددیەکان وپێش کەوتنی سەربازی وپیشەسازی وهونەری و رێکخستن، نابنەرێگر لە لەناوچوونی نەتەوەکان، ئەگەر فەرمانی لەناو چوونیان بۆ بدرێت. نەتەوەی ((عاد))، لەوانەی کۆنترین شارستانیەتیان لە جیهاندا دروست کردبوو، رووبەرێکی فراوانی داگیرکردبوو لە ئاسیا و ئەفریقیا ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ (فصلت / ١٥).

لەوانەش تەنگ پێهەڵچنینی پیاوچاك وپاك وبێگەردەکان لە گەندەڵی رەوشتیو،

گەمارۆدانیان وناچاربوونیان بە چوونە دەرەوە و کۆچ کردن بەرەو هەندەران یان ژیان بردنەسەر لە نێو لادانەکاندا. ئەمەش گەلی (لوط)، پابەندی (لوط) وبنەماڵە وباوەڕدارەکانی نەبوون لەوەی کە کارە پیسەکەیان بە پیس بزانن وەڵامەکەشیان لە نارەزایی دەربڕین ئەوە بوو کە ((وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إلا انْ قَالُوا أخرِجُوهُمْ مِنْ قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ (الأعراف / ٨٢).

هەروەها بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران و بانگخوازە دڵسۆزو باوەڕدارەکانو تاوانبارکردنیان بەوەی کە ئەو بانگخوازانە تاوانیان ئەنجام داوەو شتی نالەباریان وتووە، و سوکایەتی بەو شتانە دەکەن کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوون، لێرەدا خۆیان دەکەن بە پاسەوانانی ئایین (حامیها حرامیها). لێرەدا ئایین وەك ئەکتیفێك بەکاردەهێنن بۆ خۆ پێ پاراستن لە دەستکەوتە حەرامو رامیاریەکان. وە هەمیشە باوەڕداران بەوە تاوانبار دەکەن کە کەسانێکن سادەو بیروهۆش تەسك لەوانەیە، (شێت)ایەتیشیان بدەنە پاڵ. دەگەڵ کاروانی بە پێشڤەچوونی (تمدن) وشارستانیەت توانای وەرێکەوتنیان نیە.لە هەمووش سەیرتر ئەوەیە ئەنجامدانی بەرهەم هێنانی شیعرو، سیحرو کارە ئەفسانەییەکانیان دەدەنە پاڵ!! بەم شێوەیە خەڵکی وایان لێکرا کە شەوەکانیان لێی پاڵ بکەونو بەرۆژیش، گەڕانو سوڕان بە دوای رابواردنو یاریو کات بە فیڕۆدان بێ کۆڵ دان. راگەیاندنیش ئاگاداریانی کردنەوە کە گوێ نەگرن بۆ ئامۆژگاریکاران بە سەرجەم هۆکارەکانیەوە، وبێ هۆش وسڕی کردن بە لە خشتەبردن وفریودانی فیکری وشوێن کەوتنی ئارەزووەکان، جا، ئایا کەسێك هەیە کە لەو شتانە پەند وەرگرێت؟

﴿وَقَالَ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَار إذ تَأْمُرُونَنَا انْ نَكْفُرَ بِاللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُ أندَادًا وَاسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَاوْا الْعَذَابَ وَجَعَلْنَا الأغلالَ فِي اعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ يُجْزَوْنَ إلا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (سبأ / ٣٣).

٢٨/ رجب / ١٤٢١

# پەراوێزەکان

١. لەبلاوکراوەکانی بانگەوازی راگەیاندنی ئیسلامی /دەستەیەك لە رووناکبیرو نووسەران لاپەرە ١٣١.
٢. نووسراوەیەکی د.ماجد عرسان گەیلانی‌یە.
٣. نوسراوەکانی بانگخوازی راگەیاندنی ئیسلامی – دەستەیەك لە روون بیر و نوسەران لاپەرە ٤٨-٤٩
٤. امريكا طليعة الإنحطاط روجيه غارودي ص١٨٦
٥. اشكالية التجهيز / عنف الصورة ٣٩١-٣٩٢
٦. اشكالية التمييز / عنف الصورة لاپەرە ٣٩٦-٣٩٧
٧. هەمان سەرچاوە
٨. نقد الحداثة - الان تورين لاپەرە ١٥٦
٩. امريكا طليعة الانحطاط
١٠. الحرب التلفزوني لاپەرە ١٧٨
١١. الحرب التلفزوني لاپەرە ١٧٨
١٢. الحرب التلفزيونية / دوگلاس كينر لاپەرە ٢٨٨
١٣. سقوط الاوهام رد. محمدالرميحي لا ٢١٦
١٤. الحرب التلفزيونية لاپەرە ١٤- لە پێشەکیەکەیدا.
١٥. هەمان سەرچاوە لاپەرە ١٣٠
١٦. حفارة القبور - رجاء جارودي لاپەرە ٦٣
١٧. هەمان سەرچاوە لاپەرە٦١
١٨. هەمان سەرچاوە لاپەرە٦٣
١٩. عالم غريب / قصي الحيدري لاپەرە ٥٤
٢٠. عالم غريب / قصي الحيدري لاپەرە ١٤٩
٢١. حفارة القبور د. جارودى ٦٩-٧٠
٢٢. الدعاية الصهيونية او الطرق الخفية لتنفيذ القرار الصهيوني / ممدوح الزدى لاپەرە ١٦،١٧،١٨

٢٣. الجينو اليهودي مرد. سناء عبداللطيف لاپەرە ٣٣٣ و ئەوەی لە دواوەی دێت
٢٤. بروتوكولات حكماء صهيون راپۆرتی دوانزەهەم
٢٥. الصهيونيه وخگرها على البشر / د. محمود احمد الرميل لاپەڕە ١٣٥،١٣٦
٢٦. بروتوكولات حكماو صهيون ج٢ لاپەڕە ٢٦٤
٢٧. هەمان لاپەڕە ٢٦٢
٢٨. هەمان بەرگی ٢ مبشرات فلسطين المحتلەج ٢٤١
٢٩. مدخل الى السينما الصهيونية / سمير فريد لاپەڕە ١٢
٣٠. الصهيونية وخطرها على البشر لاپەڕە ١٣٣
٣١. الصهيونية وخطرها على البشر لاپەڕە ١٣٤
٣٢. الدعية الصهيونية لاپەڕە ٨
٣٣. الدعية الصهيونيه لاپەڕە ٩٤
٣٤. مذاهب الفكرية المعاصرة / محمد قطب لاپەڕە ٢٣١
٣٥. مذاهب فكرية معاصرة / محمد قطب لاپەڕە ١٤١
٣٦. مذاهب فكرية معاصرة / محمد قطب لاپەڕە ٥٣٠
٣٧. اليهود و تفجير الجنس / د. محسن عبدالحميد لاپەڕە ٤
٣٨. اصل الماسۆنية / عوض الخوري لاپەڕە ٢٠٧
٣٩. اليهود وتفجير الجنس / د. محسن عبدالحميد لاپەڕە ١٨
٤٠. اليهود وتفجير الجنس / د. محسن عبدالحميد لاپەڕە ١٧
٤١. سزرای سونیەر / رفعت اللخان لاپەڕە ٢٣٠
٤٢. فلسفة التنوير بين المشروع الاسلامي والتغريبي / د. محمد السيد الجنيد لاپەڕە ٧٧
٤٣. الأثـنـي/ بەو کۆمەڵگایە دەوترێت کە پێك هاتبێت لە چەند نەوەو ئاین و بیرو بۆچوونی جیا جیا
٤٤. اخرجه البخاري
٤٥. مسلم و بخاری دەیگێڕنەوە لە دەمی ابن عباس رەزاو رەحمەتی خوایان لێ بێت

٤٥. فەرمودەیەكی دروستە: مسلم تەخریجی كردووە بە ژمارە (٢٥٠٦ لا ١٩٤٨) هەروەها بە ژمارە (٢٥٠٨) بەم شێوەیە: (اللهم! أنتم من أحب الناس إلي، اللهم! أنتم من أحب الناس إلي) واتا (انصار)ەكان.

٤٦. الدعوة إلى الله تعالى / محمد حامد الغامدي / ص١٠٤ – الآية / آل عمران / ٦٤

٤٧. بە گێڕانەوەی بخاری (٥١٨٨،٨٩٣) و مسلم (١٨٢٩) وابن حبان (٤٤٨٩).

٤٨. أبناؤنا بين وسائل الأعلام وأخلاق الإسلامی / منیحداد يكن ص ٥٣

٤٩. لەگەر كاسێتێك شتی لەسەر تۆمار كرابێت، بۆ سڕینەوەی دەخرێتە ناو قالبێكی موگناتیسی كە بە ئاسانی دەیسڕێتەوە.

٤٦. صحيح أخرجه البخاري (٦٠٤٠) ومسلم (٢٦٣٧) و ترمذي (٣١٦١) و أحمد (٢٣٧/١٠) و مالك (١٧٨٧).

٥٠. سەیری في ظلال القرآن بكە بەرگی ٤ لاپەڕە ٢٢٣٩

٥١. علاقة الجان بالانسان / حسان عبدالمناف لا ١٦٢

٥٢. بوخاری تخریجی كردووە لە بابەتی نوێژ بابی (٧٥). والانبياء باب / ٤٠ وە ئیمامی ئەحمەد لە مسنەدەكەیدا ٢٩٨/٢

٥٣. انجيل مرقس / ٩ /١٤-٢٩

٥٤. تفسير ابن كثير بەرگی ١ لاپەڕە ١٤٤

# هەڵەکانی دەروازەیەك بۆ ڕاگەیاندنی ئیسلامی

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧ | ٦ | الزين | الذين |
| ٢٥ | ٨ | تگوع | تطوع |
| ٥٣ | ١٧ | (الانثى) | (الاثني) |
| ٥٨ | ١٠ | بمكبه | بمنكبه |
| ٦٤ | ١٤ | بسخح | بسفح |
| ٧٠ | ٢ | (يانەوێ يان... ) | بيانەوێ ... |
| ١٣٤ | ٣ | الصهيونيه وفگرها | الصهيونية وخطرها |
| ١٣٤ | ١٠،١١ | الدعيه الصهيونيه | الدعاية الصهيونية |
| ١٣٥ | ٦ | ... واخلاق الاسلامى | والاخلاق الاسلامية |
| ١٣٣ | ١٠،١١ | الحرب التلفزيونى | الحرب التلفزيونية |